ناوی کتێب: دیوانی کامەران موک

بابەت : دیوانی شیعر

نووسینی:حەمەی ئەحمەدی تەها (کامەران موکری)

سەرپەرشتی کردن: حسین بەفرین

تایپ: ئاکۆ

نۆبەتی چاپ : چاپی دووەم.

ساڵی چاپ :٢٠١٢

چاپ و بڵاوکردنەوەی : چوارچرا

نەخشەسازی : سۆران حەمەد

تیراژ : ١٠٠٠ دانە.

نرخ : ٩٠٠٠ دینار

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٤٨٥)ی ساڵی ٢٠١١ ی پێ دراوە.

# شاعیر لەچەند دێڕێکدا

*(حەمەی ئەحمەدی تەها) ناسراو بە(کامەران موکری)
*ساڵی ١٩٢٩ لەشاری سلێمانی لەدایك بووە، تا پۆلەکانی ئامادەیی خوێندوە.
*لەسەردەمی پاشایەتی بۆگەندا چەند جار زیندانی کراوە.
*لەدەساڵ زیاتر مامۆستای (ئەدەبی کوردی) لەبەشی کوردی- کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی (سەلاحەدین) بووە.
لەماوەی ژیانیدا ئەم کتێبە شیعرانەی بەچاپ گەیاندووە:

- ئاشتی..... شیعر
- دیاری............... شیعر ١٩٥٧
- ئاگرو ژیلە.......... شیعر ١٩٥٨
- گوڵاڵە سوورە.... چوارینە ١٩٥٩
- گوڵ ئەستێرە.......... شیعر ١٩٥٩
- ئاوات و رەنج........ شیعر ١٩٦٨
- زەبری هۆنراوە........ شیعر ١٩٧١

* رۆژی ١٩٨٦/١٢/٧ لەشاری هەولێر دڵە گەورەکەی لەلێدان کەوت و لەگردی (سەیوان) ی شاری سلێمانی سپاردەی خاك کرا.

# روون کردنەوەیەکی تایبەت

ئەم دیوانەی بەردەستی تۆی خوێنەری بەڕێز، ئەو (دەست نووس)ە ی شاعیر خۆیەتی کەکاتی خۆی نووسیوویەتیەوەو داویەتی بە (وەزارەتی رۆشنبیری) ئەوکاتەی (عێراق) تا رێگەی چاپکردنی بدەن. بەڵام هەموو پەڕەکانی ئەو (دەست نووسە) بەووشەی (یمنع) مۆر کراوەو رێگە بەچاپکردنی نەدراوە. جا چۆن (کامەران)ی شاعیر بۆ خۆی حەزی کردووە دیوانەکەی کە سەرجەم بەرهەمە شیعرییەکانیەتی چاپ بکرێت، ئاوا ئاواتەکەیمان هێناوەتە دی کەوەك هەر شاعیرێکی تری کورد بردیە ژێر گڵەوەو چۆنیش خۆی نووسیوویەتیەوە، وامان بەچاپ گەیاندووەو خراوەتە بەردەمی تۆی خوێنەری بەڕێز....



کەچی ئێوە، کە (هەر دەبن) بە تەنیا
شەرمێ ناکەن لە پەڵەی خوێنی چیا
سەنگەرەکان ئەگرین بۆ قارەمانان
ئەوان گیان، بۆ پارە نەبوو بەخشییان
ناویان نەما، گوڵی ناوتان وەرانن
پەڕەی یادی ئاگرینتان سووتان
مەگەر هەر من ناوی شەهیدانی کورد
جار جار بێنم بە سۆزی هۆنراوەی ورد

# پێشکەش

*پێشکەش بەوانە بێ کە:
لە شەوەزەنگ تروسکە“
لەماتەمی.... زەردەخەنە
لەژێرِکەوتن.... هیوا و کۆڵنەدان
لە ژیان... تێکۆشان ((ئەبینن))
لەوانەی لە ((تەما) ئەبن بە ((بروسکە))

*گیانی پاکی ئەو هاورِێ جوانە مەرگانەم
بێ کە منیان بەجێ هێشت..

## کامەران موکری

لە زیندان و لە بیابانی (سەلمان)
لە نیشانەی برینەکانی سەرشان
لە سالآنی لاویی – تەمـــەن پشکوتن–
هەلی عومرم، گوڕی هەولّی پێشکەوتن
لەو سالآنەی لــەگەلّ زنجیرا ژیام
لەو هەرەسەی ژیان بەسەریا هێنام
لە ژووری تـــەنگ، رێچکەی جرِوجـــانەوەر
لە (شیّ)ی دیوار، وەردیانی مۆن، خوێنی سەر
لە قەتماغەی لەشی بەدار شیتالّ بووم
لە لێدانی دلّی بە (خورپە) قالّ بووم
لەو پەنجانەم کـە ئاگریان پیاچـزان
لەو جومگانەی کە لەیەکتر ترازان
لەو کەسانەی تا دوێنیّ بوو وەك دوژمن
کۆتیان کردە پیّ ی سەدانی وەکـــو من
لە کۆتی پیّ، کەلەپچەی دەست بپرسن
من چیم و کێم، ئـەوان چاکم ئـــەناسن
* *

لە دارخورماو لە بیابانی سووتاو
لە سەراب و سەبوون و خەیاڵی ئاو
لەو چاوانەی خوێنی قینیان تێ زابوو
لەو کەسانەی بەشیان تەنیا سزابوو
لە کۆرپەکەم، دوکەڵی تاسەی ئەوسام
لە دەروونی ژەمبوردە بووم بۆ پەیام
لەبیرکردن، خۆزگەی تاساو بۆ ئاوێ
گڕی دەروون دامرکێن بێ بۆ تاوێ
لەکاسەیەك دۆی سەرتەزێنی کوێستان
خولیای شنەی جێ ی نسرمی دارستان
لە برسێتی و دووری و لە بێبەری بوون
لە گشت خواستی خاوێنی دڵ و دەروون
لە کۆتی بێ، کە لەپچەی دەست بپرسن
من چیم و کێم!! ئەوان چاکم ئەناسن

* *

قارەمان نیم، بەناوبانگ نیم، گەورە نیم
شاعیرێکم بۆ نەتــەوەی کــورد ئەژیم
چیم لـە دەست هات کردم بۆ نەتەوە و خاك
چیم بەســـەرهات دام بە خـــەندە بەبێ باك
سەرم بەرزە سەرشۆڕبوونم نـەزانی
ئارامی خۆم، تاسەم کرد بە قوربانی
لەچیاکان، لـە لوتکەی بەرزو نووا
لە ئـــاگـــــری بەنێڵە نێڵی بڕوا
لە کۆتی پێ، کەلـەپچەی دەست بپرسن
من چیم و کێم، ئـــەوان چاکم ئەناسن
١٩٧٠

ئاگر بە نەختێ ئـاو کـوژایەوە
گوڵ بە بای پایز سەری نایەوە
بەڵام ژیلەمۆی تێـکۆشـــانی کـورد
دوای (هەزاران ئاو) هەڵگیرسایەوە
گوڵاڵــە ســوورەی جـوانی ئازادی
دوای خەزانی زەرد هەر گەشایەوە

ئەمەوێ بمرم لـە هەردا، لـە چـۆڵ
(با) گەردی لـەشم بکاتە ناو دۆڵ
نەك بە مل کەچی بژیم سەد ساڵێ
دوژمـن زیندانی خـۆم پێ بمـــاڵێ

# جێمی وڵسن

(چیرۆكی شانۆ)

حاكم: موتتەهەم بێ جێمی وڵسن
بـــانگ كـــەر: جێـمی وڵـــسن
حاكم: ناوت چیە؟
-: جێمی وڵـسن
پەروەردەی خەم، سزا چەشتن
هــەژارێكـــی مەچەك ئاســن
حـاكـم: تەمـەنت؟
-: پەنجا ساڵ ئەبێ
حاكم: ئیشت؟
- : دەربەدەر و بێ جێ
كـارگــەرم رۆژانـــەم جــنێو
زۆر شەو ئەنووم بێ نان و شێو
دەمێ قاپیوانم لـــــەشـــار
دەمێكیش لەلادێ جووتیار
بۆیاخچیم، لەلەم، گەسك دەر
زۆر لـــێكراوم دەربـــــەدەر
حاكم: خەڵكی كوێ ی تۆ؟
- : خــەڵكی ئێرەم
ئەم خاكەیە وڵاتەكەم

(مدعی) گشتی: ئەم درنجە گەورە رەشە
کــــۆمـــەڵـــــێ تـــاوان و خـــەشە
دڵی سیخناخ بووە لە ژان
بەرامبـــەر پـــارە دارەکان
ئەمەندە بێ فەڕە ئەڵێ
نابێ سپی بە مــن بڵێ
تۆ نۆکەری وەرە سەر چۆك
بۆ دەوڵـــەمـەندی نیویۆرك
ئەڵێ من رەنجی شـــانی خـۆم
ئەبێ وەك ئینسان خۆم بیخۆم
ئەڵێ رەشیش وەکو سپی
ئەبێ بە ســەربەستی بژی
ئەی داد پەروەر ئەی گەورەی من
ئەمەیە رەفتاری وڵسن
رۆژێکیش لـە شۆخە ژنێ
پرشنگی جـــوانی ئـەڕنێ
بەداسی نیگای ژەنگاوی
ئەدا لـە پەرچەمی خـاوی
جانتاکـەشـــی لێ ئەدزێ
گۆڕ وایە، لـەشی دارِزێ
لـەبەر ئەوە داوامە مــن
بیفەوتێنن جێمی وڵسن

حاكم: بانگی كەن خاتو جین ریسڵ
بـــانـگ كـــەر: خـــاتـو ریســـــڵ
حاكم: ناوت چیە؟
- : گەورەم ریسڵ
حاكم: تەمەنت؟
-: پێـــم ئـــەڵـــێن هـــەژدەم
-حاكم: تۆسقاڵێ ناجوڵێنی دەم؟
چیت دیوە دەری خە بۆمان
لە كردەوەی پڕ لە تـــاوان
جین ریسڵ: ئەم رەشە وای تێ ئەنوارێم
تیـــری چـــــاوی ســـــنگی سمیـــم
پشكۆی سەرنجی ئەنـــایە
ئەم سەرسنگە بێ هاوتایە
نـــەختێ روتیـش بوو بـــەرێكەوت
جار جاریش هەمووی دەر ئەكەوت
دوای ئەوەی تێر سەیری كردم
دوو دۆلارەكەشـــی بــــردم!!
(مدعی گشتی): گەورەم ئەمە لەناو نەبەن
زیـــان لـــە ئـەمـــەریكـــا ئـــەدەن
حاكم: تۆ چی ئەڵێ ی جیمی وڵسن
دەربـــــارەی خـــۆ رزگـــاركردن

جيمی وڵسن: من رەشم وەكو (شەوە زەنگ)
وەك دووكــەڵـــی بـۆمبـــاو تفـــەنگ
لە ناو شەوەزەنگی لەشا
لە قەفەزی ســنگی رەشا
دڵم مانگێكە وەك ئــاڵتوون
تریفەی گەش، دڵگیرو روون
رەنگم رەشــە، وەك دڵــی تۆ
دڵم گەش وەك تیشكی ئاسۆ
ئــەرێ ئێوە دیمـوكــراتین؟
دیموكراتی سەوزە، یـا، شین
ئێوە زەروون بۆ خوێن مژین
كوللەی خەڵەوخەرمانی ژین
لەسەر نەرمی (رۆك ئاندرۆڵ)
لەشی هەژار ئەكەن بە خۆڵ
من ئینســانم خەڵكی ئێرەم
ئـا، ئـەمـەیـە وڵاتەكـــەم
بۆتان بلۆی دنیا یەكسەر
ئەكەن بە گڕی سوتێـنەر
شاری جـوانی هێرۆشیما
چیتان لێ نەكرد بە بۆمبا

دڵی دایکی سپی یا ڕەش
ئەنێنە ناو. ئاگـری گەش
ئینجا تەنەکەی ڕەنگ کـراو
ئەدەن بە دایکی کوڕِ کوژراو
مەدالیایە، ! هی پیـاو کوشـتن
تاکەی بەم چەشنە خوێن ڕشتن
تـــاکەی برینـــی پـــڕِ ئازار
لـە کەڵبە و نینۆکی زۆردار
ئەمڕۆ ڕەش و سپی بران
سەربازن بۆ شادی ژیان
ئەمـە بـــوو وتـەی دڵـــی من
پشکۆی نوتقی جێمی وڵسن
* * *
حاکم: مردن.... مردن
بڕیار درا جیمی وڵسن
بە کارەبا لـەناو بـەرن
جیمی وڵسن: بمرێ هێزی ستەمکاری
وەرگـــــەڕێ تـــەختــــی زۆرداری
بژی هێزی چینی کارگەر
بـــژی بە ئازادی بەشـەر

کاروانی ئێمە کەوتۆتـــە رێگا
بەئامانجی کورد هەر ئەبێ بگا
ئـــەگەرچـــی شـــەوی خـــەباتی ژیـان
گیانی زۆر لاوی وەك گوڵ هەڵ وەران
بەڵام هەر ئەبـێ شـــەفەق دەرکـــەوێ
کورد لەم هەورازە سەختە سەرکەوێ

ئـــەگەر ئـەیـــزانـی هـــۆزاری کێـــوان
کێ گوڵی ســـووری بـــاخی هـــەڵ وەران
یـــا خـونچە کـێ بوو چـڵەکـەی شـکان
هەژار کێ لێ ی سەند ئەرك و هەوڵ و نان
هەرایەکـــی وا زل بەرپا ئـەبوو
زەبری پایز و زۆردار تیا ئەچوو

# پەپولەی بەهەشت

چـاوت کــەوتە نیـگا رشـــتن
ئـەی فریشتەی بەهەشـتی مـــن
لــە رزینـی دڵــۆپـی ئـەســرین
لەسەر خونچەی کوڵمی شیرین
مــەلی دڵـــی داخــــورپـــانم
ئـــاگری بــــەردا لــە گیـانم
پرسیت ئەرێ بەڕاست گیانە
تۆو ( شیرینی ئەم ژیانە )؟
تۆ منت خـۆش ئەوێ بـــەدڵ؟
وەك من گیانت هاتۆتە کوڵ؟!
من ئەڵێم: هەرچی شك ئەبەم
بە یەك تریقــەی تـۆی ئـەدەم
تەنیا، بۆ یەك زەردەخــەنە
بۆ لـەرەی ئەو بەرگەردنە
هەرچیم هەیە مـــایەی ژیان
بە، ئانیێ، ئەیکەم بە قوربان

## دوا رۆژ

ئــەڵێن گوڵی شادیت وەران
دوا رۆژی ژینی خۆت فەوتان
هــەرەست هێنا بــە قەڵای
کامەرانی ی دڵ و هیوای
بــە هــۆنراوەی خوێنین وتن
بە، وشەی ئاگر رێك خستن
خۆت کرد بە هــاو دەمی ناسۆر
بە هاورِێ ی خەم، خەفەتی زۆر
کەو تورویتە چیــا پـــەرستن
باسی بەژن و خاڵ و گەردن
دەمێ ئەگری وەکو مناڵ
ئەبی بە پوولەی خەیاڵ
تاوێ لەگەڵ مەلی دەنگ خۆش
نــاخی دڵت دێنیــتــە جــۆش
ئاسمان و ئەستێرەی شینی
بەهار و گوڵی رەنــگینی
تاڤگە و قەڵبەزی وەك چۆرِی
دۆڵیان و جۆگەی بــە گورِی
بـــەیان و دیمـــەنی ئاسۆ
بوون بە (پەرستراوی) تۆ

لەسەر مشتێ خاکی وەتەن
چەند جار لە پێت کرا پێوەن
بۆ رەش و رووتە چینی برسی
هەر چیەك، ئـەکەی ناترســی
نە ناوت هەیە! نە ســامان
نە ماڵ و نە ژنێکی جوان
بەم جۆرە لـێشـــــاوی تـــانە
دێت بەسەر کام شیعرا جوانە
چونکە من شیعری وەکو گڕ
نادەم بە پارەی ســارد و سـڕ
(بـۆ ئێـوە زێـڕ پـەیا کردن)
(منیش خزمەت هەتا مردن)
هەر یەك ئۆخەی ئەم میللەتە
نـــادەم بە هـەرچـیەك هـەتە

# دەفتەری کۆن

ژووری رەش، دەفتەرێکی پـان
چوار پێنج سیسرکی بە سزمان
مێزێکی گەورەی کۆن و شڕ
کۆمـەڵـــێ کـاغـــەزی ونجڕ
یادی کۆنم، هی هەشت نۆ ساڵ
بیـــرەوەری شـــــیرین و تـاڵ
رژانە سەر رووباری گـیان
گەرداوێ هەڵسا بێ ئامان
لـــەو دەفتـــەرەدا، یـــەك یـــەك ناو
ریز بوو بوون وەك گوللەی سووتاو
ئەمیان هی دزێ بوو برسی
لەتاو نان ئەیکێشا حەپسی
ئەو یان هەژاری بێ تـاوان
یەك بە دوای یەکا ئەگریان
ناوت چیە؟... من؟ ... کامەران
پێتەوەیـــە خـــاڵ و نیشـــان؟
پیاوێ بوو خوای دەفتەری کۆن
شـــێوەی رێوی ســەرنجی مۆن

چوومە ناو لاپەڕەی دەفتەر
ژمارەی خۆمم کردە بەر
بیبەن بۆ ناو جەرگی زیندان
(بۆی داکوتن کۆتی گران)
چوومە ناو چوار دیواری تەنگ
ئێوارە بوو دنیا بێ دەنگ
دەنگێک قاقایەکی ئەنارد
ساڵی حەپسی خۆی ئەژمارد
وس بن ئەمە دوو، نەءسێ ی پڕ
لەم زیندانەدام سەر و مڕ
هەر ئەوە بوو تاوانی من
وتم کەس مەکەن بە گاسن
هەژار مەکەن بە خشت و بەرد
بۆ کۆشکی بەرزی سوور و زەرد

# پاراو

پەروانە، لە تیشکی چـــرا
لەو شەوقەی وا، لە ئاگرا
یا، شەماڵ، لە چرۆی پاراو
بەهار، لە هـــاژە هاژی ئاو
بێزار بن هێشتا دڵی من
لە تامی جوانی پەرستن
وەڕس نابێ تاکو ئەمرێ
وەك گوڵی پایز ئەوەرێ

# جۆرنیکا

لەناو جۆرنیکای وێرانا
لـــەژێر، شینایی ئاسمانا
ڕێبوارێك ملی ڕێ، ئەگـــرێ
ورد، ورد، ڕێ ی ژیان ئەبڕێ
بەرخۆلـەیەك لـە باوەشیا
کۆترێك لـە دڵی گەشیا
گـۆرانیـــەك ئەڵێ ئـــازاد
بۆ گیانی گشت ئادەمیزاد
نەغمەی یاخی بوونێك خاوێن
گۆرانیەك بۆ هـەمـــوو شوێن
سـرووودێکـــی لێ ئەبیـــستی
کە ئەڵێ: (ئەی خۆشەویستی)
سوپاس، سوپاســی بێ پایـان
سوپاس (نا) بۆ زۆردارەکان
ســـرودێك ئەڵـــێ پڕ ئـاوات
بۆ (دنیا) نەك هەر یەك وڵات

زەردەواڵەی ئازار و قین
ئەفڕن بەرەو ئاسمانی شین
هێلانەکەی دڵ جێ دێڵن
یەك لەدوای یەك هەڵ ئەفڕن
دنیا، (تۆ، وی)گۆرانیکەی
کە پڕە، لە خۆشی و ئۆخەی
ئەمێنێ دوای گشت کارەسات
دوای هەر شتێك بەسەری هات
هەنگوین ئەکاتە ناو دڵان
ئەیکاتە ناو دەمی ژیان
جۆرنیکا، ئەی جۆرنیکا گیان
هەر بێ تاوانی بێ گومان
زاڵ ئەبی بەسەر تاوانا
تاکو (ئەبەد) لە ژیانا

---

( تێ ئەکۆشین بۆ رۆژێك کە ئادەمیزاد، رەش و سوور و سپی و زەرد لە سێبەری ئاشتیا بژین ).

# شێخ مەحموودی نەمر

بۆت ئەڵێم لە دێڕی شیـوەن
دوور لـە وردکاری و لـە فەن
کام وردەکاری، کـــام هــونەر
هەڵبەستی جوانی وەك گەوهەر
ئەتوانێ وەسفی تۆ، هەرگیز
بنێتە، ســەر کاغـەز بـەڕیز
باسی دڵ، هی ئەو دەروونە
ئەو بیـر و بـــاوەڕە ڕوونە
ئەی کۆچ کردووی مەشخەڵ هەڵگر
(( نـاتـوانم بیــکەم بە شیـــــعر))
خۆزگە فریشتەی شیعری گەش
بـەدڵ ئــەیگـــرتمە، بــاوەش
ئەیبردم بۆ لای خوای وتن
دێڕێ جوانی ئەدا بـــە من
چەند دێڕێك ورد، بۆ یادی وا
ئاگــر، لەناخی دڵ بــــەردا

ئەی شێخ مەحمووی شانازی کورد
هەمـوو بەجـــارێ گـەورە و ورد
فرمێسکت بۆ ئەرێژین... دڵ
بۆ، کۆچـــی تۆ، هاتۆتە کوڵ
با نمی ئـەشکـی (کوردستان)
لـە جێ ی مەدالیای قارەمان
بکەین بەو سنــگە پـــانەدا
(( لـە سۆزی ئەم گریانەدا))
ئەڵێم و هەر وتوومە.... هـــەر!
ئەی گەورەکەمان، ئەی سەروەر
((خۆڵەمێشی)) گەرووی بازیان
(زیندانەکانی هیندســـــتان)
خوێناوی چەمی (کەناروێ)
زامی دوژمن کە دێتە سوێ
(ئاوبـاریـك)ی دابێـــــــژراو
بە گوللـەی دەسرێژی بە تاو
ئەتناسن گەورەی کۆچ کردوو
ئەی تێکۆشـــەری نەمـــــردوو

گەورە پیاوەکەی نیشتـــمان
هەمیشە زەردەخەنەی جوان
لەسەر لێوی وەك زێڕی خاو
یا وەك کزنگـی خــۆرەتاو
بریسکو هوڕێ بوو، شیرین
وەکو نیشانەی نەبــــەزین
لە دەربەندی بازیان کە هات
کڵپەی ئەسەند گڕی خەبات
بەتاو، کە هێرشی ئەبـــرد
ئەینرکان و بانگی ئەکرد:
مردن بۆ گەل شانازیە
دڵم بەو مەرگە رازیە
((ئــــەستێرەی ئـــادەمـی نشین))
لەجێ ی خۆی وەرگەڕی بەتین
پـەراش پــــەراش بێ لـە تـــەما
( ئەوسا، من ئەڵێم: کورد نەما )
کورد بۆ ئازادی وەتەنی
خۆی ئەکا بە سوتەمەنی
( گیانی من کە نەختێ گەردە
بۆچی نەیبەخشم بەم کوردە)

لەناو قوڵەی دەروونەوە
لەو دڵە پـاکە روونەوە
دەنگی رزگاری کوردستان
ئەهاتە دەرێ و ئـەیبزرکان
بانگی ئـەکرد: ژیان بۆ کـورد
ئەمرین و ئەڵێین (گیان بۆ کورد)
لەبەر فرمێسکی لێڵ و خـوڕ
خامەکەم هەرچەند هاتە گوڕ
نەیتوانی بنووسێ پتر
بۆ یادی کۆچ کردووی نەمر
هەر ئـەوەنـدە بڵێم مەگـەر
گیـانی پیرۆزی تێکۆشەر
( ئەوی ئالآکەمان پێ دا )
( وا لەناو دڵی ئێمـەدا )
ئێستە لە یاد، بۆی ئەچنین
وێنەیەکی جوان و شـیرین
ئاخۆ، کەی بێ کورد لە گەوهەر
لـە یاقـووت بۆی بکـا پەیـکەر

١٩٥٧/ رۆژنامەی (ژین)

---

(ئەوی هەر بۆخۆی بژی ئەمرێ بەڵام ئەوی ژیانی بۆ گەل تەرخان کا لـە دڵی گەلا نەژی)

# جوانی رووت

کراسی پەمەیی تەنك
کراسی پەمەیی تەنك
وەك پەڕەی گوڵ لە پایــــزا
لەسەر گۆی مەمکی ئەخزا
هەراسان بوو کەمەری شاڵ
لە سنگی گۆشتن و لە جاڵ
نەرمایی قۆڵ، لا مل و شان
بەو بەرگە نەرمە ئەڕووشان
مانگ چار شێوی هەوری لابرد
چرای زەردەخەنەی هەڵ کــــرد
دەستی هێنا تریفەی گــــەش
کۆ کاتەوە لە تیشکی لەش

گژو گیا سـەریان دانـــەوان
لـە دەوری پیێ و پلی گەڕان
بە پریشکی گۆنای.... ئاسمان
ئەستێرەی سنگی داگیرســـان
پەڕەی گوڵ و نمی ئـــاورنگ
مژی یان بۆنی عەتری ســنگ
چرۆ و خونچەی جوان و ناسك
چاویان بڕی یە گۆی مەمــــك
وتم: ئەی کچۆڵەی نیان
لـەوەدایە نرخــــی ژیان
کە دەم و لێو بگاتــە دەم
بژاکیێ ئەگریجە و پەرچەم

١٩٧٠

# ئاگر و هەنگوین

نوێنت ئەگری بۆ تەنیایی
سنگت ئاگرە، هەنگوینە
ژینی ئاڵۆز، بەخـــۆڕایی
کوشتی ئەو سنگە شیرینە

* * *

ئەم کوڵمە جوانە ئەم بــەژنە
بە، (تەنیا) پەیکەری عاجـــن
ئەگەر، بژین هەر، بەم چەشنە
ئەو، نەخشە وردانە ئەمـــرن

* * *

دەسیان، لـە ملی شەنگایە
گەرچی تانە، لـە تۆ ئەدەن
دڵیان وا لـە ئاهــەنگایە
ئاواش لـە گیانی تۆ ئەکەن

* * *

ئــــەزانم دەمـــــاری لــەشـــت
وەك دەمـــــــاری پڕ بـــارووتن
خۆ کچی جوان چاوی گەشت
پشـــکۆی ئاگرێکـــــی رووتـن
* * *
بـــــــەڵام بیـــــری باخــــــەوانت
کۆنە، وەك چیرۆکی جـــــــاران
شـــــوو بۆ دڵـــــی پڕ لە ژانت
لای ئەو، ماڵ کەچیە ئەی جوان
* * *
دەك کوێـــرایی بیری دایە
کە تۆی ئاوا بەستۆتـــەوە
خۆشی کام شت نارەوایە
دەروازەی بۆ کــردۆتەوە.

# چەرپای ئاڵتون

بنوو، لەسەر چەرپای ئاڵتوون
لە تەلاری رەنگاو رەنـــــگا
ئەم کۆمەڵە دڵەش مردوون!!
لە تاریکی شـــەوە زەنگا
بنۆشە، خوێنی دڵ پاکیم
لەناو لەبی دەسی خـۆما
بیکە بە زنجیرێك چاکیم
شەتەکی دە لەئـەستۆما

# سێ نامە

## نامەی سەوز

نامەی سەوزیم نایە سەر دڵ
پڕی بوو لە وشەی وەك گوڵ
چاوی دڵداریم پێ ی پشکووت
تاسەی خۆشەویستیم بزووت
خۆری نامەکەی کە هەڵ هات
بوژایەوە باخی ئاوات
نوسیبووی: (ئەی یاری شیرین
ئەمەوێ پێکەوە بژین
بمکە بە هاورێ ی ژینی خۆت
گیانەکەم زۆر دڵسۆزم بۆت
نامەکەی هەستێکی پێ دام
پێم ببەخشێ ژینی بەتام
بۆ پرشنگی زەردەخەنە
بۆیە لارە ئەم گەردنە

## نامەی زەرد

نامەی زەردی کە پێم گەیشت
مشتیٚ ئەسرینی خەمی رشـــت
نوسیبووی: ئەی هیـــوای ژیان
تـاکـەی دیـــل بی لـە بیـابـان

* *

گەردە لوولی زەرد هەڵی کرد
نیشتە سەر لێـــوم لـــی ورد
دەسوپەنجەیەك وەك کافوور
بۆی نوسیبووم پەیامی دوور
نامەکەی پڕ بوو لـە خـــەفەت
نامە سەر چاوو سەر روومەت
پیاما رشت ئەسرین و تاسەم
سووتا بە گـڕی هـــەناسەم
هەر بۆ یەك ئان چاو پیٚ کـــەوتن
سەد خۆزگەم ئەخواست بۆ مردن

## نامەی سوور

نامەی سووری پشکۆی ڕژان
نامە سـەر دڵی پــڕ لـە ژان
هەڵی کرد گەرداوی سزام
وەری گێڕا کەشتی ئــارام
نوسیبــووی ژینی تەنیاییت
ئەندێشە و ناسۆری جیاییت
نێرگزی خەندەمی وەران
خۆشی لـەناو دڵما مـران
مـوتورفـەکـەم گـەردنی لار
منیش خەمگین لە دووری یار
دەستی داوەتە بەر ئــــەژنۆ
ئەڵێ: هەر من ئەگریم بۆ تۆ
دووریم لـەوەی ئەپیــەرستم
یەکسەر لە پەلو پۆی خستم
هەر بۆ یەك ئان چاو پێ کەوتن
ئاوات ئەخـــوازم بە مـــردن

بەڵام تا چاو بڕ کا بۆ دوور
داخراوە بەڕیز تەنــــوور
چیا ئاگر، رووباری خـوێن
هاژە ئەکا لـە هەموو شوێن
تازە نایەمەوە گیــــانە
خۆم ویستوومە ئەم ژیانە
گیانەکەم ئەگــــەر بمێنم
تۆڵـەی ئەم خەمە ئەسێنم

١٩٦٥

کوردێك کە ئەچووە بەر دەمی قەنارەکە
ئەمەند مەرد بوو، بەمردنی ئەوت رامەکە

درکێ بم لەژێر تاوێری بـــەردا
لە گردی چۆڵا، دەوەنی هەردا
گەڵێ خۆشترە، گوڵاڵـە بم مـن
لــە ئینجانەدا هەڵـــم وەرێنن

لە خۆ بایی بوون لە سەرکەوتنا
یا نائومێـــــدی لەژێر کـــەوتنا
لە ناو دڵێکا پەروەردە ئەبن
تیا نەبێ مانای ژیان و مردن

# کچە نەغەدەیی

بەژنی ناسك، قژی زێـڕین
بالآ بەرزێکی خوێن شیرین
ورشەی ئەو روومەتە ئاڵە
هی ئەو بەر گەردنە کاڵە
لەگەڵ پرشنگی چاوی روون
ئەڕژایە دڵ و نـــاو دەروون
وەسفی بە هەنسکی شمشـــــاڵ
پـرژایە دەشت، دەوەن، قەد پاڵ
کچە کوردی تابلێی جوان
وەکو فریشتەی خەوی شوان
ئەو کـــچە جوانەی نەغەدە
چاوی بەخشی بۆ ئەم کوردە
دوژمن پێی وت: ئەی وردیلە
ئەی کـچە کـوردی نەشمیـــلە
حەیفە، روومەت، کەمەر، بەژن
چاوی گەلاوێژی و گەردن
ئەبەخشی بە لەوێچـــی خۆڵ
ئەی کیژی ساویلکەی کلۆڵ

وەرە وەك كـچێـكـی سـەلار
پێت ببەخشین كۆشك و تەلار
هەر تەنیا (یەك) وشە بڵێ
لە پەنهانی شەرکەری دێ
پێمان بڵێ كام پەناگا
كام كەژ ئەكەن بە بارەگا
ئەتبەخشین ئەی كچی بچووك
ئەی خنجیلانەی ئێسك سووك
ماچ كە، دەس و پەنجەی سەردار
مـەبـە، بە قـوربانی هـەژار
با، ڕوومەتی ئاڵی ناسـك
نەڕژێتە سەری خوێن تك تك
با چاوی سـەرنج ئاگـرین
ئەی كچە كورد هەڵنەكۆڵین
كچ ووتی: ئەی زۆردارینە
بۆ ئەم خاكـە نازەنینە
قوربانە هەموو ژینی مـن
بژی كورد با بمرێ دوژمن

من سەرم شۆڕناكەم هەرگیز
پێشمەرگەم بۆ كوردی ئازیز
جوانی چاو، قژ، ئەم گەردنە
ئەم بەژنــە كوا هینـــی مـنـه
ئــەبم بە قـــوربانـــی ولآت
بۆ كورد گیانم ئەكەم خەلآت
لای من شانازیە و خۆشــی
بلێن كچێ چاوێ بەخشی
ئەی چاوی گەش هەڵت كۆڵن
خۆشترە لە چاو شۆڕكردن
ئــەی بــرژانگی ورد نەلـــەرزی
بە چاو بلێ بۆ كورد ئەمـــری
چەند خۆشە، چاو، بێ بەدیاری
بـــۆ ژیـــانی كـــوردەواری
هەردوو چاویان گوشــی بــە تین
بە پەنجە، تا هەڵیان كۆڵـــــین
خوێن رژایە سەر رووی نازدار
بانگی كرد: با بمـــرێ زۆردار

ئەی کچە کوردی قارەمان
لە بیری ناچێ: کوردستان
ئەی چاو هەر بلەرزە و بلّێ
دوژمنی کورد ئەبێ هەلّـــێ
کچە (نەغەدەیی) نازەنین
ئەبێ تۆلّە هـــەر بسێنین
(ئالاّی خەباتمان نانەوێ)
(کوردینە تۆلّەمان ئەوێ)

# تەلەفۆن

ئەو رۆژە، مات بووم دڵم تەنگ
دانیشتبووم مەلـــوول بێ دەنگ
گـــەردنـم لاری خـــەیاڵێ
خونچەی دەمی، کوڵمی ئاڵێ
پەردەی بیستن زۆر عەزرەتی
بۆ جریوەی بەلـەزەتی
سێ رۆژ ئەبوو دەنگی نەرمی
وردە رازی خـۆش و گـەرمی
نەیدابوو، لە پەردەی هـەستم
لەرووما، دیاربوو، زۆر پەستم
لە ناکاو، تەلەفۆن زەنگی
شێوانی گۆمـی بێ دەنگی
پەپوولەی وشەی ورد، بە جۆش
هی قسەی گەرم و گوڕی خۆش
لە دوورەوە، بە پۆل فڕین
بۆ هێلانەی دڵی خەمگین
وشەی زۆر شیرین و بەتام
تێکەڵاو بە نەغمەی هیوام

رژایە سەر لێوی وشـــکم
ناو دڵۆپی گەرمی ئەشکم
دەنگی پیرۆز و شـــیرینی
نەغمەی خۆشی پێکەنینی
لەدڵما بوون بە گۆرانی
بە ئاوازەی کامەرانی:
((هەر دەنگیّ دیّ من وەزانم))
((تەلەفۆن ئەکەن بۆ گیانم ))

## پەروانەی هۆنراوە

(هۆنراوەی گەشم بە چەپك
ئەنێیتە سەر سنگی ناســـك
گوڵێکی ئاڵــی وەك دەمت
بە ناز ئەدەی لـە پەرچەمت
پەروانەی هۆنراوەی (شەیدات)
ئەگەڕێ لـە دەوری گۆنات
یا دەم ئەبەی شیعری بە تام
ئەمژی ئەی پەپولـەی هیوام
کەچی نابێ من بە خــەیاڵ
هەڵمژم لێوی گەش و ئاڵ
نابێ ئەو لێوە پاراوە
بنێمە ڕستی هۆنراوە
دیوانەکەم ئەی کچی گەش
وەك کۆرپە ئەگریتە باوەش

بەڵام نابێ من سنگی جوان

بنێمـــــە باوەشـــی دیوان

هۆنراوەی من ئەکەیتە بەر

بەڵام نابێ بەژن و کەمـەر

یا لا مل و قژ و گەردن

لە هۆنراوەی منا هەبن

نابێ ناوی سەرسنـــگی رووت

یا گۆی نازداری وەك یاقووت

بە نووکی خامەکەم بێنم

تاسەی دەروونم بشکێنم

١٩٦٤

# کەمانچە

شکانیان کەمانچـــەی دەستم
بەڵام زوو فریاکەوت، هەستم
دروستی کرد، لە پەڕەی دڵ
تەلـــەکانی لـــە تاڵی گوڵ
ئـــــاوازەکەی هەناسەمە
نەغمەی ئاوات و تاسەمە
دەنگی بڵندە، وەك، ژیـان
بەسۆزە وەك قاسپەی بەیان
لە گوێ ی رووباری نەبەزین
ئەڕێـــژێ ئاوازی شـــیرین

# پێڵوو

لە پێڵووما منـــاڵی ورد
پەنایان بۆ برژانگ ئەبرد
ئەسرین کە لەچاوما تکا
یانزە قەنارەی تیا شـــکا
ریزێ لاشەم لە پێـڵووا
وەکو درەختی گڕ رووا
لە پڕ نرکەی ژنێکی کورد
وەکو رەشەبا هـــەڵی کرد
لــــــقی دڵانی داتـــەکان
دوا بەری سامی لێوەران
سەری دوو لاشەی نایە کۆش
دڵی مـــەرگی هێنـــایە جۆش
قیـــژانی و وتی: ئەی زۆردار
کوا نیشانەی کۆڕی کوشتار

کوا خوێن لەسەر سنگ و روومەت

بـــۆچـــــی خنـــکـــانتـــانن بـــە پـــەت

لەبەر چی بە گوللە و بۆمبا

نەبوون بە گەردی چنگی با

لەپڕ پەنجەی ناسکی گەســـــت

خوێنی گەشی رایەڵەی بەست

بەو خوێنە رووی کوڕی رەنگ کرد

وتی: (بژی روو سووری کورد)

١٩٦١

# دیواری سەوز

ڕووم، تێکە، ئەی کچۆڵەی شەنگ
ئەی گـــەردن زەردی گەنم ڕەنگ
با دڵ، لەگەڵ تریفەی مانگ
(هێمن) بژی تا دەمەو بانـگ
وەرە، لەگەڵ سروەی شەماڵ
بنۆشم قەترەی دەمـــــی ئاڵ
لەبیرمە، دەستەی دڵ مردوو
خۆیان و کوتەکی مـــاندوو
دوای دارکاری ئەوانی تر
هاتنە ویژەم وەك ئاگر
ئەتوت دیوارێکی ســەوزن
چاویان پشکۆ، دڵیان ئاسن
ترپەی پێ ی وڵاخی سەرکێش
دڵی گەڕەکـی خســـتە ئێش

رووم، تێکە، ئەی کچۆلّەی شەنگ
ئەی گـەردن زەردی گــەنم رەنگ
تـــا، نەهاتـــونەوە بـمبەن
وەك پیاو کوژێك زنجیرم کەن
با تێر سەیرت بکەم، شەیدام
ئەی گولّی ناسکۆلّەی هیوام
خاوەنی عەشقێکی پەتیم
گیانە دەمێکە عەزرەتیم
با ماچت کەم نەك ئەمجارەش
بـمبەنەوە زیـندانـــی رەش
ئەگەر چی هەرگیز سزادان
تاریکایـــی قوولّـــی زیندان
لام نادەن لەم رێگە راستە
ئازادی گەلـم مـەبـەستە
سەیرم کە ئەی کچۆلّەی شەنگ
ئـەی بالاّ بـەرزی گەنـم رەنگ

١٩٥٧

# شه پۆلی زێڕ

چیای ڕەنگین....
داوێنی کەژ، نێرگس و گوڵ
گزنگ لەناو کۆشی چەما، ئارامی گرت
ئاسمانی شین"...
ئەستێرەی زیوی رووی سڕی
شەوبۆیەکی خنجیلانە
لەسێبەرا
پێکەنی سەری هەڵبڕی
بۆ تیشکی خۆری گەرم و گوڕ
دڵۆپی قەڵبەزەی وەك چۆڕ
چاوی هۆزار
شنەی شەماڵ، سروەی نازدار
چەمی بزێو

* * *

هۆزاری چـــــــەم

فڕی، فڕی تا هەور و تەم
خۆر، لـەنـــاو پەلی درەخـتا
وەك بگەڕێ بە دوای بەختا
سەرەتاتکێ ی ئەکرد لە گوڵ
کـەوتە شنەشن پۆپـــی چـــڵ
بەردی کەنار خۆیان ئەشت
ئاوی خوڕ مرواری ئەڕشت
شەونم لە (خۆر ماچ کردنا)
زەرد هەڵگەڕا
لـە چیمەنا پۆڕی نەرمـــــین
بە لـەنجەولار، ڕەوتی شیرین
چیای ڕەنگین
پەڕەی گوڵاڵەی ناســـکۆڵە
شەماڵ هێنابووی، لەو دۆڵە
تاڵ تاڵی گوڵی تەڕی خــــاو
گەڵای پاراو
خونچەی تەڕ، بە شەونم و ئاو
دایان پۆشیبووم وەك پــــەری
چرۆ لـەجێ ی خۆی ئەوەری

چاوم لێك نابوو، گوڵی سوور
لـه دەورم فەرشی بـێ سنوور
پەنجەی هێنا...
کچێکی جوان
نەرم و نیان
پێڵوومی جولاّن بە نەرمی
سەرنجی دامێ بە گـەرمی
وتی گیانە
وتم: ئەی فریشتەی جوانی
مژدەی خۆشی و کامەرانی
باڵی ئالاّن لـە گەردنم
گەردنی... کاڵ وەکو هەتاو!
پرچی زەردێکی نەرم و خـاو
چاوی کانی هـــەستی شیرین
پرشنگی وەك ئەستێرەی شین
وتم خۆشـــم ئەوێ ی بـــە دڵ
وەکو شەماڵ بۆ پـەڕەی گـوڵ
وتی: کوا بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ
-: (منی هەژار بەرگم شیتاڵ)
وتی: ئەی گۆرانی و ئاهەنگ؟

وتم: کسپەی دڵ و دەروون

-: کوانێ ئاڵتون؟

-: وتم نیمە!

-: کوا کۆشکی بەرز و کوا تەلار؟

وتم: کۆشکم وا لەوێوە منی هەژار

پەنجەم درێژکرد بۆ چەمێك

کوختێکی تاریك و نوو تەك

زریکانی و رووی وەرگێڕا

ئەو جامە ئەشکەی دای نابوو

پیاما ماڵی (قلێپ) رژا

خۆی هاویشتە شەپۆلەوە

(شەپۆلی زێڕ)

دڵی کرد بە قوربانی ئـــەو

لەبیرم چۆوە، بوو بەخـــەو

# شەڕی گەورە

لە دالآنی مزگەوتێکا
بـرسێتی دڵــی ئەپێکا
زەردە پەڕی ڕەنگ ئاگرین
رژایە ناو حەوزێکی شـــین
لەسەر بەردە نوێژێکی پان
یەکێ دەستی کرد بە بانگ دان
ئـاوازەی ورتـەی خـــواناســـین
هەڵئەسا، ورد، مات و غەمگین
دوای ئەوەی نوێژ کۆتایی هات
دوو کوێری بەسزمانی مات
کام وشە گەرمە زۆر بەتین
کامـیان دڵ دێنێتە لەرزین
ئەیانرِشتە گـەرووی دالآن
ڕستیان ئەکرد بۆ لـەتێ نان
پشتێن ڕەنگ زەردی وەك گۆگرد
باسی سنوقە چای ئەکرد:
(تۆ بووی نانی منت برِ)
من؟ براگیان منیش وەك تۆم
هیچم نیە ئەم شەو بیخـــۆم

لــــەناكاو بوو بە شـــەڕەدار
زريك و هۆڕ، گرمە و هاوار
دلۆپی خوێنی لەشی زەرد
ئەپژایە سەر دیـواری بەرد
قـــەومـــا شەڕێكی ئێجگار زل
تا هات مەلای شۆخ، چاو بە كل
مـەلا پۆشتە و تێر و تـــەســـەل
دەری كـــــردن بە پـــەلـــە پەل
هەندێ لـە كوڕە دەوڵـەمەن
كە هەیانە شتــی دەگــمەن
ئەیان فەرموو!! شەڕی ئاوا
ناشـــیرینە بـۆ مــاڵـی خوا
لام وابێ هەر ئەو شێوانە
بـردیـانن بۆ بـــەندیخـانە
نازانم تێریان خوارد لـەوێ؟
ئەمە پرسینێكی ئەوێ....

# دیاری نەورۆز

بۆ رۆژی نەورۆز، سێ چەپك
لە نێرگس و گوڵی ناسك
ئەکەم بە دیارییەکی جوان
بۆ گەلی کوردی قارەمان
(گولاڵە سوورەی پارچەی دڵ)
(هی دڵێك کە کەوتە ژێر گڵ)
دڵی ئەو لاوەی بۆ میللەت
جەرِانیان لە گەردنیا پەت
چرای گیانیان کوژانەوە
شەماڵ جەستەی شەکانەوە
ئەم چەپکە گوڵەی من پێشکەش
بەوەی (گر) ئەگرێتە باوەش
بەو لاوانەی کە بۆ وەتەن
لە خەباتا پشوو نادەن
(بۆ ژینی گەل بوون بە پێشەنگ)
بوون بە مەشخەڵی شەوە زەنگ

نێرگسی دەشتی هیوای ژن
کە بۆ رۆژێك، تێ ئەکۆشن
جەرگیان بەسەر، درکا، نەدەن
ئەگرێجە، دەسکەنە، نەکـەن
رۆژێك بێ کۆرپەلـەی رووخۆش
- زۆردار- نەیفرێنێ لـە کـۆش
ئەم چەپکە نێرگســـــەی ژیان
پێشکەش بە تۆ بێ دایـە گیان
بە تۆ و بەو ژنانەی دوژمن
کورِە، گەنجەکانی کوشتن
* * *
گوڵە زەردی کوڵمی هــەژار
کە (وەریوە) بە قامچی و دار
پێشکەش بێ بە هاورێ ی پاڵە
بـــــەوەی ژیـــانی لا تـــاڵە
بە هەژارانی شار و دێ
بەبێ کەسانی سەرە رێ

ئەو گوڵانە ئەم سێ چەپکە
کە پەڕەیان تەڕ، ناســــکە
لە یەك دەشتا، یەك چیمەنا
لـــــەناو دەروونی وەتـــەنا
هەر لە یەك جۆگەلەی یەك شوێن
مـــژیـــویـــانـــە، دڵۆپی خـــوێن

*          *          *

دوای پێشکەش کردنی دیاریم
ئەڵێم (بێ شك) کوردەواریم
ئەی نەورۆزی هــــەزار ساڵە
لێ ی هەڵدێت، شەبەقێك ئاڵە

١٩٥٨

# کەشتی ژیانم

کەشتی ژیانم لـە گـەردا وایە
تۆ وی گولاڵەم لـە خوێناوایە
دەسی زامارمە، سەوڵی ئەم گەشتە
گیانـم ئاوارەی بـاخـی بـەهـەشتە
کام بە هەشت! کام باخ، کام گوڵ و گوڵزار
(پێشێلی) ســوارەی ســوپای ستــەمــکار
گوڵ ئەوەرێتـە ژێر سـمـی وڵاخ
گرە.. بەر ئەبێ لە دەرروونی باخ
چەمە، لـە پێچا ئەگری وەك منال
ژیانە بەندی ناو زیندانی تاڵ
ئەی تروسکەکەی ئاسۆکەی هیوام
مەگەر، هەر تۆ بێ ی، بگەیتە فریام
ئەی گۆڕستـانـی شـەهیـدانـی (ســوور)
با هەڵسێ، هەڵسێ، لەسەر سنگت نوور
مەگەر ئەو نوورە، بێ بە چراخان
روونـاك کــاتەوە شەقامـی ژیان

١٩٥٧

# دەس و پلی

لــەنــاو کــچانا، زۆرم دی
بەژنی رێك، پێستی پەمەیی
چــاوی گەش و کەمــەری شل
ورشەی سنگی جێ درزی جل
رووتــی ســەرشــان و بەرگەردن
جوانی پێ و پل، کولمی گۆشتن
بەڵام دەس و پەنجەی وا جــوان
نەبووە، نی یە، ئەی پەری گیان
ئەڵێ ی قەڵبەزی زیوینە
ئەو دەس و پلە شــیرینە
نینۆکەکانت وەك یاقوت
بێخی دلم بۆیان بزووت
کە دیــمان قەڵبەزی زیندوو
گلێنەی دلمان ئەبلەق بوو
من و گەنجەکانی گوزەر
ئەمانوت هونەرە، هونەر
دەسی وا لـە دەس بکەوێ
دڵ تاکــو مــاوە بــسرەوێ

١٩٥٨

# هۆنراوەی ئاڵ

لە، تریفـەی مانگـی زیوین
پرشنگی گوڵاڵە و نەسرین
لە، جوانی گەردن، تەوالێت
هەر نەخشێکی شیرین هەبێت
لەمانەو فرمێسـکی دڵـخواز
لە، چپەی خۆش و وردە ناز
لە ئاوریشمی نەرمی هەستم
نەغمەی خۆشی دڵی مەستم
بـە پـەنجـەی نـازداری خـەیاڵ
تۆم دروست کرد ئەی شیعری ئاڵ
تۆش وەکو باڵداری بزێو
ئەچیتە ناو بریسکەی لێو
خونچەی دەروونم ئەمژێ
ئـارامی گیانم ئەکـوژێ
کەچی نامبەی بۆ ناو دەمێ
کە من هەروا تۆی ئەدەمێ
هەرچەندە زۆر بەلـەزەتی
بەڵام ئاخ چەند بێ سـفەتی

## باوەشێنی گیان

لە شیعری گەرمی ناسکۆڵە
ئەی فریشتەی جوان، کچۆڵە
پەپولەیەکم کرد بۆ تۆ
رەنگم کرد بە تیشکی ئاسۆ
نەخشاندنم بە تاسەی دڵێ
بۆ دڵداری پاك ئەکولێ
ناردم بۆ باخی دڵداریت
کەنار قەڵبەزی نازداریت
نیشتەوە، لەسەر گۆنای گوڵ
کەوتە لەرزین بەجۆش وکوڵ
پرچی زەردت بە نیانی
کەوتە باوەشێنی گیانی
کەچی خونچەی دەم، کە لەرزی
هیوای، پەپولەکەم بەزی
هەڵفڕی هاتەوە بۆ لام
بەڵکو نەختێ بگرێ ئارام
لێم پرسی چیت وت خونچەی دەم
خونچەی دەمی شیرینەکەم

بەڵام وەڵامی نەبوو، مرد
نازانم بۆچی وات لێکرد
وا خۆم هاتوومە لات گیانە
تۆ ئەو بەژنە ڕێك و جــوانە
تۆ شووشەی مەچەك و گەردن
چیت وت بە پەپولـەکەی من
نە شیعرەکەم نە نامـــەی ئاڵ
کاری تێ نەکردی چــاو کاڵ
بڵێ:.....، وا خۆم هاتووم شیرین
منت ئـــەوێ ئـــەی نــــازەنین؟!

تام نی یه بــگات به هــی دڵداری
ئــازاریـش نی یـه وەکــو ئـازاری
تا نـمی ئەشــکـی دڵــت نـەڕێـژی
تامی خونچەی دەم هەرگیز ناچێژی

لەلای من عەشق و دڵداری چیایە
لە دوور سەد دیمەنی شیرینی تیایە
بەڵام کاتێ کە دڵ کەوتە نزیــکی
ئەبینێ دەرد و ئەندێشەو ســـزایە

لە ئاسمانی سەربەرزی یا هـــەزاران
بوون بە هەور خوێنی خۆیان ئەباران
لەسەر کەژی رزگاری یا کوڕی شەنگ
چنگی گیر کرد لە گەردنی شەوەزەنگ
لەوێدا بوو بە دەستی خۆی، خۆی سوتان
لەبەر تۆ بوو، بوو بە (رۆژی) کوردستان

# سوتووی پەیام

نازداری دڵ، ئـــەی لـە دەروونا پشــکۆ
ئەی درەختی مانگ و ئەستێرە و شەوبۆ
ئەی پەپوولەی زەردەخەنەی خەیاڵـم
کچۆڵەی شەنگ، تاقە گوڵاڵەی ئاڵم
ئەی جوانترین هۆنراوەی تازەی دەروون
ئەی ئاوازی بڵێسـه، لــه دڵ بەربـــوون
ئەی چاوی دڵ، ئەی شیرینتر لە چـاوم
پێشکەشت بێ، تاڤگەی تاسە و سڵاوم

*　*

ئێستە لە ناو سەنگەرێکام سك سوتاو
لێو عەزرەتی، دڵ عەزرەتی قومێ ئاو
ئەنوارِمە دەمـــــی ئەوانەی مــــردوون
پشکۆی تەزوو لە لێوی دڵم ئەسوون
ئەو دەمانەی کە ئاکامی گیانە لاو
بانگیان ئەکرد هاورِێینە، قومێ ئاو
دوێنێش وابووم، بەڵام دوێنێ کوشتاربوو
خۆ نـواندنی دوا شـــالاوی ئـازار بوو
گرمەی بۆمبا، فریشکی چیـای ئەخست
بۆ گیان وەرین مردن دەشتی رِا ئەخست

که هێلانەی گوللەمان ئـــەورووژان
کەژ موورەغەی پشتی پڕ ئەبوو لەژان
کـە درنجی دووکەڵـــی گڕی چیا
چنگی قژی گیر ئەکرد لە گژوگیا
کە ئاگری هاواری هەڵمەت بردن
بەر ئەبـــووە دڵـی ئاسنـی مـردن
دوا دڵـــۆپی ئارەقی لێڵمان ئەڕشت
دوا درنجی ترسی دەروونمان ئەکوشت
ئەمرۆش چیا. خۆیی و کەژاوی جوانی
چـاوەڕوانە بۆ کــوشـــتار و قوربـانی
وا دیارە خاك بۆ گەشەی بەهاری نوێ
خـوێنـــی تری لاوانی کـــوردی ئەوێ
( ئەگەر هات و نامەکەم دوا پەیام بوو)
دڵـی منیـش بـــەقـوربانی چیـام بوو
جار جار لەبەر تریفەی مانگەشەوا
لەناو باخی پڕ لـە هەنسکی خەوا
لەسـەر ئاوی کانییەکـی سـارد و روون
کە زەردەپەڕ تێ ی ئەڕژێ وەك ئاڵتوون
یادی لێوی تینووم تەڕکە بەو ئاوە
گوڵی یـادم بـدە لەو قـژە خـاوە

# ئەختەر

زامی ئەختەر.....
زامی ژنی وڵات پەرەوەر
وەك فوارەی نوری هیـوا
خوێناوی گەشی هەڵئەدا
هەزاران گیانی ئاگــرین
وەك شەپۆلی گڕی بەتین
بەربوونە جەرگی شەوەزەنگ
بوو، بە تەق و تۆقی تفـەنگ
بناوانی پەروا رما
ئاگر لە ئارام بەردرا
خەفەتی چەند ساڵەی ژیان
تەقی وەکو بۆمبـای گـران
سنگی ئەختەر ئاڵ وەك شەبەق
تیَ ی ورووکا گوللـەی ناهەق
چەند جوان بوو، لەجیاتی خشڵ
گـەردانەی قەتـرەی خوێنـی دڵ

ئـالآ لـه نـــەرمـایی گــەردن
شەرمەزار بوو، هێزی مردن
لـەسەر لـوولـەی ڕەشی تفەنگ
(کۆڵنەدان) کردی بە ئاهەنگ
دەلاقەی زامی وەك پشکۆ
بانگی ئەکرد وەتەن بۆ تۆ
بەم چەشنە ئەمرن کچ و کوڕ
بۆ شـــەوی ژیـن ئەبن بە گڕ
* * *

ئەی لاوانی کـــڵپەی ژیان
لـه جیاتی خەفەت و گریان
لــــەم ڕۆژانـــەدا بۆ ئەخـــتەر
پەیکەرێك بکەن، لـه گەوهەر
لیێ ی بنوسن (سلێمانی)
شاری هەڵمەت و قوربانی
شانازیه، بۆ گــەورە و ورد
ژنی وای هەبێ گەلی کورد
* * *

ئەی ژنی شەهیدی ئــازا
کە خوێنی گیانی تۆ رژا
گوڵێکی ئەوتۆی پێ پشکووت
دڵی هەموو کورد بۆی بزووت
چونکە گوڵێك بوو سوور و گەش
پڕ لە شەونمی تۆڵە و خەش
ئەی گوڵی سووری ناسك نێژ
کە بووی بە قــوربانی دەسڕێژ
سروودێکمان بۆ گیانت خــوێن
پڕبوو لە قەترەی سووری خوێن
* * *
ئەختەر ئێستەش چریکەی تۆ
وەك تریشقەی دەمــی ئاســۆ
دەنــگ ئەداتەوە لــەم شــوێنە
شوێنێك پڕ لە جۆگەی خوێنە
رەنگی برینەکەی لەشت
دڵۆپی خوێناوی گەشت
نەخشن لە کەناری شەقام
هەوێنن بۆ شیعری هیــوام

تۆ، لە چاومای ئەی قارەمان
برژانگ لەجیاتی ئەرخەوان
چەتری ئەو گیانە پیرۆزەن
سێبەر بۆ جەستەی تۆ ئەکەن
ئەختەر لەناو باخی دڵا
لەناو چیمەنی پڕ گوڵا
پەیکەرێکم داناوە بۆت:
( ئاگری سوورە وەکو خۆت)
لە دڵما شوانی شمشاڵ ژەن
لە گۆرانیدا بۆ، وەتەن
ناوت دێنێ بە کوڵ، بە سۆز
ناوی پیرۆزت ئەی دڵسۆز
یادت وەکو زێڕ و گەوهەر
(قەت ژەنگ هەڵ نایەنێ ئەختەر).

١٩٥٨

---

(ژانداك) یان سووتان، (زێڕین) کچەکەی شاری نەغەدە، هەردووو چاویان هەڵکۆڵی، (ئەختەر)یش قورقوشمیان بەسنگیا توانەوە لەڕێ ی (ئازاد) یا

# لۆمۆمیا

گوڵە مینای زەردەخەنەی ناسك وەری بــوو
باڵی وشەی خۆش و بەتام سڕبوو تەزی بوو
لێو وشکی خەم، چاو بە تیری سام پێکرابوو
دڵ بە چنگی زەبری سزاو ناسۆر گوشرابوو
مــناڵ سنـــگی ئـــەوەندە دی شــەقا شــەقار بوو
مەمکی دایکی لەبەرچاو کەوت لە شیر بێزار بوو
پشکۆی گەشی گونـدی سووتاو کوڵمی مناڵ بوو
نیلە نیڵی ئاگر تێکــەڵ بـــە گــڕوگـاڵ بـــوو
پەنجەی زۆردار لە کوشتنی مناڵ و دایکا
کارامە بوو نیشانەکەی، یەکسەر ئەپێکا
کاتێ گولـلەی رۆڵەی کۆنغۆش کە گیزەی هات
جووڵە نەبوو بەرەی دوژمــن خاوو کـش و مات
پەڕەی وردی نێرگزی لێو سیس بوو ژاکابوو
لێوی وشەی تەڕ و ناسك پێکــا لــکـــابـوو
گوڵ ئـــەگـــریا و دوا دڵـــۆپی شـــەونمی ئەڕشت
بۆ ئەو کوڵمەی خۆڵەمێش بوو لەسەر رووی ئەنیشت
بە ژیلەمۆ و بە دووکەڵی کۆرپەلەی سووتاو
ئەپۆشرا بـــەری چـــاوی کەژاڵی هـــەتاو

ڕەنجبەرەکان لەناو گەرووی سزاو مردنا
بە دیلێتی یا لـــە کۆڕی خـــوێناو ڕشتنا
ڕەنجبەرەکان لەناو زەلکـــاو و لـە دارستـــانا
لەگەڵ قرچەی گەرمای هاوین کزەی زستانا
ڕەنجبەرەکان بە برسێتی و ڕووتی و نەبوونی
شەو نخونی و، سزا کێشان کزی و زەبوونی
ڕەنجبەرەکان لەوکاتەدا ئەکران بـە نیشـــان
بانگیان ئەکرد: (بژی شۆڕش بژی تێکۆشان)
وشەی گەرمی لۆمۆمبا بوو لە گەرووی مەرگا
ئەبوو بە خۆر لەسەر لێوی لاوی بـــەجـــەرگا
تاڤگەی خوێناو لە هاژەیا، یا چەمی ڕەنگ گرِ
ئەیووت بیری لۆمۆمـبایـــە هێزی ئـــاگـــر برِ
لە ئاگر و لە ئاسن و لە زەبری دوژمـن
بەهێزترە، هێزی لەشە بۆ هەڵمەت بردن
پیـــاوێکـــی شـــەنگ، تـــەمەنی پڕ دنیا دیەیی
زمان شیرین، گفت و گۆ خۆش، نەرم و شێنەیی
ڕەنگی پێستی زەرد باوێکی کەمێ مەیلە و ڕەش
دەم و لێوی وەك کۆنغۆیی خرپن، چاوی گـەش
وات ئەزانی جوتیارێکە قاڵ بووی ڕەنجی شان
سەربازێکی هەروا سادەی ڕێگـــەی تێکۆشان

چونکە لای ئەو: (ئەو زانایە، لــــە خۆبایی بوون)
خووی نزمی بوو، بیری تاریك نەك باوەڕی روون
ئەو کە گیانی لەبەر گەلی لا خۆڕایی بێ
ئیتر بەچی، یا لــەبەرچی لـــەخۆبایی بێ
لۆمۆمبای بەرز لە پاش ئەوەی ئاگــری خۆش کرد
کۆرپەی هیوای بە باڕووت و بە خوێناو گۆش کرد
لەپاش ئەوەی خەوی دیلی لە میللەت زڕان
پـــەڕەی بیری نـــائومێدی رابــوردووی دڕان
لەپاش ئەوەی قارەمانی رەشی گیان پۆڵا
بەرەو کۆڕی تێکۆشانی رزگاری جووڵا
خیـانەتی پـــارەزادە، چـــرپەی گـــەیانە
داگیر کەری دوژمنی گەل هێزی بێگانە
پـــەنجـــەی تـــاوان درێژکـــرا بۆ زنجێکی دوور
وتیان: ئەمشەو دێتە ئەوێ تیشکی بڕوای سوور
گیرا مانگی گەلی خەبات، لۆمۆمبای مەزن
بە وتەی رەش، هەموو لەشی کرا دەرزیاژن
هەردوو دەستی رەنجی سووری پەنجە بە پەنجە
بە بزماری گەورە، کـامـــی، کۆڵ و گـــرنجە
بەسەر پشتی تەختەیەکا، بزمار ڕێژ کران
پێیان ئەووت: بانگێ بدە، بۆ جەنگاوەران

دەست هەڵگرن، چەك سەرەوخوار سەردانەوێنن
هــەر بەو جــۆرە تۆ ئــەمێنی و ئەوان ئــەمێنن
لۆمۆمبــای بەرز، هەتا كوشتیان وتی پەنجەی من
هیــچ نانــووسێ لەبەر خواستی گڵاوی دوژمن
من ئــەكــوژن بــەڵام گــەلی كۆنغۆی تێكۆشەر
دەست ئەنێتە بینی ئێــوەی رسواو داگیركــەری

١٩٦٦

# پەرداخیٚ ئاو

سەرنجێکی گەشی بەتـام
چاوی دڵداری هەڵهێنام
موتورفەیەك بوو خوێن شیرین
بەژنی شـــووشـــە، قژی زێڕین
دەنگی، پەنجەی، ڕەنگی لاجانگ
وەکو تریفـەی گـەشی مـانگ
(هات پــەرداخیٚ ئاوی یامیٚ)
ئاو بوو؟ یاخود چەشنە تامیٚ
نە لێو چەشتبێتی نە گیان
پەرداخیٚ لـە ئـاوی ژیان
خۆزگە جارێکی تر ئەمچەشت
ئاو لـە دەستی پەریی بە هەشت

# زەبر

لە سنگا، دوو سێوی گوڵ بە دەم کاڵ و تورت
گۆی دڵیان بە تیری خورپــەی تیژ دا ئــەگرت
وەك قوببەی هــەیــاســە بێ لەرە و بزووتن
ڕووی دەمیان ئەکردە چەناگە و بەر گەردن
ڕوومەتی گوڵی گەش- لا مـلی وەك هــەتاو
بەژنیٚ ڕێك، ناسکۆڵە، ئەگریجەی زەرد و خاو
کە من دیم خوێنی گەش ئەچۆڕا بۆ سەر سنگ
ئەسوڕا لە لاملی ئــەگریجــەی وەك گــزنگ
بێ لەسەر مەچەکی شووشەیی و لەسەر ڕوو
تا ئەو دیو پەردەی گۆشت بە زەبر ڕۆ ئەچوو
گوڵی دەم بوو بووە بە خونچەی نەپشکووت
گــەردی ســام لــە کۆشی پـەڕەیا ئەبزووت
گلێنەی ئەوەندەی خولی خوارد لــە ترسا
تا گیر بوو لە گۆشەی چاوی وەك نێرگسا

ئەو کچە، ئەو جوانە، ئەو بەژنە نازدارە
ئەو شەنگە، ئەو گوڵە بێ باخ و بەهارە
کــەوتــە ناو چڵپاوی پــایزی گوڵ وەرێن
ناو لیتەی تاوان و ناو گۆمی سووری خوێن
وەك بەفری ڕێ ی ئاسمان خاوێن بوو داوێنی
بەم ڕەنگــەش ئابڕووی تکــایە ناو خوێنی
کچانی دراوسێ کە وەك ئەو جوان نەبوون
ڕەفتاری پۆخــڵیان پــۆشیبوو بــە ئاڵتوون
دیبوویان هەنگی ماچ ئەو گوڵەی مژیبوو
چــنۆکی دەرونیــان لــە تــاوا تــەزیبوو
قــاویــان دا منــاڵی بزێو، هیچ نــەزان
لەو کچە بێ کەسە وەك سەگ وڕووکان
خاتوونی کەتن باز، کە وەستای کارانە
ئەو کچەی دەرپەڕان بەو بانگی شێوانە
ئەو شەنگە ئەگەرچی دوای ئەوەش هەر ماوە
بەڵام کز، دڵ شکاو، گــوڵی ڕووی ژاکــاوە

١٩٦٩

## سروودێك

ئەستێرەیەك بووم پەردەی شەوەزەنگ
بە ورشــە ورشـــی گــەشـــم ئەپووا
تۆوی گوڵاڵەی پێ دەشتی بێ دەنگ
لە خۆشی شەوقی رووی مـن ئەڕووا
* *

ئێوارە وەختە لـە دەمی کـــەلا
کاتێ رووناکیم ئەرِشتە کانی
لەگەڵ فڕین و جریوەی مەلا
جریوەم ئەهات بە شادمـــانی
* *

کشام وەك تیری زیوین زۆر بە تاو
سەرەو خوار هاتم بەرەو ئاوی زیو
وەکـــو مـــەلێکی گڕ تێ بەردراو
کـــەوتمە داوی دەوەنی نـــاو شیو
***

چەشتـــم ناسۆر و ســـزایـــەك بـــە تین
جـــەستـــەم بـــە خەم و مەینەت دارِزا
تا پشکۆی دەروون، پشکۆی نەبەزین
گڕی لـــــە دار و لـە دەوەن بـــــەردا
* *

دوای ئەم سزایە ئینجا بووم بە مانگ
تریفــەم دنیــای رۆشــن کــردەوە
دەمە و ئێوارە نزیك کاتــی بــانــگ
وترا کۆڵ نەدان جیێ ی خۆی گرتەوە

* *

ئــەم بــەستە خۆشەی هەستم بۆی وتن
گــۆرانی گەرمی کورە شــوانیێ بوو
ئەو شوانەش دوایی هات، وتی بە من
ئــەمــە ســروودی قــارەمــانیێ بوو

* *

ژین ئاگــریێ بیێ و کلّپە بسێنیێ
لە بەفری دیلی ئێجگار خۆشترە
دەنگیێ بۆ شــادیی گەل بنرکێنیێ
لە دەنگی زەلیل زۆر بە جۆشترە

١٩٥٧

# نایاب

لــــه ژوورێکــــا خنجیـــلانـه
کام شت نایابە، هی دەگمەن
کام پێخەف و خشڵ جوانــــه
هەمووی بە رێکخراوی هەن
*

لەم ژوورەدا قەترەی ئەسرین
رژایـــە ســـەر روومـەتی پان
ژنی شۆخـی دڵ ئــــاگــرین
بە خورِ دەستی کرد بە گریان
*

جوان بوو کـەمــەری شـل و مل
پــووزی وەکــو شــووشە وابوو
سەرسنگ، بەرگەردن، شان و مل
هەموو (جوانی یەك) یــان تیا بوو
*

گـــريا ئەو شۆخە گريانێ
تەزووی ئەڕشتە ناخی گیان
بەڵێ لـــەشێ، دڵێ، گیانێ
شەیدا بوون بۆ تامی ژیـــان

*

لە پـــڕ قیـژانی و بانگی کرد:
بۆچـــی منیـان بـــە تـــۆ داوە
بـــە پیری، شـــادی دڵم مـرد
ئەم چـــاوە، ئـــەم قژە خـــاوە
ئەم لـەشە، ئەم کوڵمە سوورە
ئـــەم گـــەردنـــە بـلـــوورە
لە بەرچـــی بمـــرن بـــە تەنیا
ئـــەی دڵ هەتا ماوی بگـــری
فـــریشتـەی دڵـــداری گـــریا
کـــە گـــریـــا ژنی وەك پەری

١٩٥٩

# پەنجەرەی سەوز و سوور

ئەوسا دنیا، لەلای دڵم خۆش و بــەرین بــوو
باخی هەستم گوڵزارێکی گــەش و ڕەنگین بوو
بەهاری گیان، هەمیشە تەڕ، جوان و پاراو بوو
لە دەروونا خوڕەی تاڤگە و قەڵبەزەی ئاو بوو
ئەو سەردەمە، نە گرژی بوو، نە کسپەی خەم بوو
دڵم خۆش بوو، لێوم گــەشی زەردەخەنــەم بوو
ئاسۆی ژینم وەکو لێوی (کۆرپەلە) ئاڵ بوو
ئاسمانی گیان پیرۆزەیی، تــەنیا ســاماڵ بوو
مانگی هیوام هەر چــواردە بوو، تریفەداربوو
کانی خەوم، روون و هێمن، بریسکــەدار بوو
ئەو سەردەمە،(شێردڵ)م بوو، جوان و خرپن بوو
نــۆبــەرەم بــوو، شــا ئــاواتی ژیــانی من بوو
تازە پایز شانەی ئەکرد ئەو قژە خــاوە
کە شێر دڵی، نازداری دڵ هاتە دنیاوە
(ماڵەکەمــــان، عــرووسی بــوو ئاوێنە بەن بوو)
دیواری ژوور، نەخشی ناسك، ورد و دەگمەن بوو
لەسەر دیوار شەوبۆ و نێرگز، هەڵکەندرابوو
بــە ئاوێنە نــەخشی دارگــوڵ چەسپێنرابوو

پەنجەرەکان داری گوێز بوون، بە شووشەی رەنـگین
بـــە ئێواران رەنگیان نـــەرشت وەك پـــەلـکەزێڕین
ئەو سەردەمە، رووناکی ژوور، شەو چل چرابوو
لـــە بنمیچی نـــەخشاویـــدا هەڵـــواســـرابـــوو
کە شێردڵ بوو، لەبەر تیشکی چل چرای جوانا
لە کەلەگی گەورە و خۆشاو لـــە پشتەیـــوانا
حەوت شەو کۆڕی ئاهەنگ گیرا، تا دەمـەو بەیان
دەمـــێ بـــەستـــە تـــاوێکـــیش لاوکـــی نیـــان
ئەوسا دنیا لەلای دڵم خۆش و بـــەرین بوو
باخی هەستم گوڵزارێکی گەش و رەنگین بوو
باوکی شێر دڵ، دەمێ بـووە و، دەمی هەژار بوو
ساڵێ بێ ئیش، دەرامـەت کز، ساڵێ توجار بوو
بەڵام سەخی، پارە لای ئەو وەك چڵکی دەس بوو
لە پاشەکەوت، پـــارە لادان ئێجگار وەڕس بـــوو
بـــاوکـــی شێر دڵ، دڵسۆزانە کـــوڕی بێ گـەیان
لە خەم رەخسی، خۆی دایە دەست گەرداوی ژیان
شێر دڵ، گیرا، تۆمەس خولیای وەتەن پـــەرستی
سەردەمێ بوو، لیَ ی سەندبوو، ئارام و هەستی
زرەی زنجیر بوو بە نەغمەی خەمی دڵی مـن
بە نەعرەتەش بۆ هەڵمەت و بۆ تۆڵە سەندن

حەوت ساڵی تیژ، پەرەی دڵی ئارامی پێکام
بە حەوت ساڵی ئاگراوی گڕم گرت، سووتام
ئەو لە زیندان، منیش لەناو زیندانی ماڵا
ئەو لەگەڵ کۆت، منیش لەگەڵ خەم و خەیاڵا
ئەو لەو دیوی دەرگای ئاسن دیوار و تەلبەن
من لە ژووری نەك ئاوێنە دڕکی خەفەت بەن
ئەو پەرۆشی لە پێ ئاسمان، یا قوولانجێ شاخ
من عەزرەتی باخی رووی ئەو، ئەو عەزرەتی باخ
حەوت ساڵ دڵم بێ بەری کرد لە بینینی دەشت
نە گەڕان بوو، نە ماڵان بوو، نە ئارەزووی گەشت
حەوت ساڵ لاشەی زەردەخەنەم لەناو دڵما ناشت
چەند بەرزییە قوربانی وا، بەرز و بێ پاداشت
ئۆخەی شێر دڵ، دوای حەوت ساڵی رەشی خەم چەشتن
دوای رەهێڵەی حەوت پایزی ئەشکی لێڵ رشتن
دێمیتەوە بە سەربەستی، پێ لە کۆت ئازاد
من دڵ خۆش و تۆ رووخۆش و منالەکەت شاد
بەڵام حەوت ساڵ دەم و چاوی گەشی ژاکانم
دوا مێخەکی هیوای خۆشی هەڵ پچوڕکانم
نە ئەو دڵە و نە ئەو شنەی زەردەخەنەیەم
نە ئەو شەوقە لەڕووما، ما، نە ئەو ئۆخەیەم

نە ئەو زەوقی جل و بەرگە و گورروونی پۆشین
نە روو خۆشی، نە هاژەکەی تاقگـەی پێکەنین
بە وەیشوومەی حەوت پایزی ماتی ژیانم
لێزمەی سزا، لێشاوی خەم، گەڵا ڕێزانم
باخی شادیم مایەوە ســەر مشتێ چــڵ و چــێو
گەڵا خزا، گوڵ هەڵوەری، خەم نیشتە سەر لێو
دوای چەند ساڵێ بگرە و بەردە و شەو ترسی گرتن
شەونوخونی و ڕاچــەنین و خــورپــە و نــەنووستن
دوای چەند ساڵێ کوژانەوەی چرای دەرامەت
گــیرۆدەیی، تــانــەو پــلار، ناسۆر و خەفەت
دوای چەند ساڵێ خڵتەی تاڵی نەبوونی چەشتن
ئەشکی سووری بە پــەنهــانی و ئاشکرا ڕشتن
دەست سپێتی کۆتایی هات، کەوتە هــەوڵ دان
بۆ دوا رۆژی جگەر گۆشەی، بۆ تیکەیەك نان
بەڵام ئارام ئــەڵقەکـانی هــەر زوو ترازا
دیسان پشکۆی خەم و ناسۆر بە دڵما چزا
گێژەڵووکەی سزا ئۆقرەی دڵمی رامــاڵی
میوەی پشووم هەر مایەوە بە کرچ و کاڵی
لەسەر لوتکەی چیای سەختی بە خوێن پەڵاوی
لە ئەشکەوتا، لەبی دەشتا، دێ ی دووکەڵاوی

لە دەروونی بە ئاگری تۆڵە سـوتاوا
لەناو جەرگی هەژارانی رۆڵە کوژراوا
لە باوەڕا، سەر بەرزییا، لە بێخی دڵا
لە ناو دڵی لاوەکان و دڵی شێر دڵا
گەردە لـوولی ئاگـراویی شۆڕش هەڵی کـرد
دیسان شێردڵ هاواری کرد: (ئەژی ئەوی مرد)
کاتێ ژیان کەوتە بەر پێ ی گەردن کەچ کردن
رێ نـامێنێ بـۆ رزگـاری بێجـگە لە مـردن
شێر دڵ، رێگەی چیای سەختی هەوڵی گرتە بەر
لـە هـەڵمەتا تەنیا سنگی ئـەکرد بە سـەنگەر
تـامی خۆش و، خـەوی خـۆش و تاسە و ئارامی
سەرجەم هەمووی لە رێ ی کوردا کرد بە قوربانی
لـەنـاو کـۆڕی تێکۆشانا دلێر و بـە جـەرگ
چەند ساڵێکی هەڵ کرد لەسەر گوڵە ژەنی مەرگ
شەوێ کە مانگ مات و مەلوول ئەینواڕییە چڵ
پایزی زەرد رەنگی سووری ئەڕشتە سەر گڵ
کاتێ ورتە، لەناو گەرووی زیرەی فیشە کا
لەگەڵ خولیای ئارام وەکو شوشە ئەشکـا
کـاتێ پـایز لـەسەر لوتکەی بڵندی چیا
لە جیاتی من بەسەر لاشەی شۆخا ئـەگریا

گوللەیـــەکی بێ بـەزەیی چـــزا بـــە سنگیـــا
تفەنگەکەی لەپاش لەرزین سست بوو لە چنگیا
لەشی کفتی بە (٣٠)سی ساڵەی خەبات ئەنجن بووی
زامـی سنگ و دڵی گــەورەی لە لێدان کەوتووی
بە فرمێسکی چاوی شەماڵ، گوڵی وەك چرا
ئەشکی تاڤگە بە شێنەیی و بە نـەرمـی شۆرا
بە نیانی و میهرەبـــانی چیای پشکۆ گـــڕ
بەتاڵی شەو ئەستێرەی گەش، توێژاڵی ئاگر
بە دووکەڵی ئاگـــردانی دڵی بـــە جۆشی
لاشەی شەنگی تیکۆشەری ئازای داپۆشی
ئێستە هەرچی ئەندێشەیەك پاراوی خەمـە
لە ناو دڵ و لە دەروونی تاریکا هـــەمـە
هەرچی خونچەی ئاوات هەیە هەمووی هەڵوەرین
هەرچی چـاوی یادم هەیە هـەمـــوویان ئـــەگرین
جگەر گۆشەی جگەر گۆشەم، وەچەی کەساسم
نەك بە شێوە هەر بـــە سـۆزی دەنگا ئـــەناسم
چاو لێڵایی و دڵ ناسۆری تاریکی داهـات
خەفەت لەگەڵ جەهەنەمی دەروونم راهات

من ئـــەزانم تا تینوێتی خۆی نـــەشکێنیٚ گڵ
لە دڵۆپی خوێنی گەشی زۆری وەك شێردڵ
وەردی هیوا، تۆوی ئامانج پیٚ ناگـــەیەنیٚ
چنگی نەوەم، داسی بەرهەم، راناوەشێنیٚ
من ئەزانم شانازییە گیـــــان بیٚ بە قـــوربان
نەتەوەی کورد، چیاکانی خاکی کوردستان
بەڵام ئێوە ئـــەی کـــــوردینە، زۆرتان نەفـــامن
نرخ و بەرزی خۆ بە کوشت دان هێشتا نازانن
لە لای ئێوە، گڵ مــەیل بڕ، شەهید ناو ون بوو
کیٚ ئەسووتیٚ، با بسووتیٚ بیٚ بە ســووتـــــوو

١٩٧١

## هەڵبەستی من

هەڵبەستیکم لێ بزر بوو
وەکو بڵێسەی ئاگر بوو
هەڵبەستێك شیرین، گەرم، جوان
پــڕبێ لە جــۆش، هــیوای ژیان
ئاوازەی وەکو خوڕەی ئـــاو
گەش وەك پرشنگی خۆرەتاو
ڕەوانتر، لە ئاوی ڕووبار
سپی وەکو بــەفری نزار
هەڵبەستێك بی تــەڕ و ناسك
دووربێ لە گریان و هەنسك
پــاراوتــر و ئـاڵتر لە دەم
لێ ی نەنیشتبێ تۆزی خەم
زۆر گەڕام بۆ ئــەم هەڵبەستە
کە خۆشترین نەغمەی هەستە
پەپوولەی هەڵبەست هەڵمژین
فـڕی بۆ زۆر جێگـــەی شیرین
چووە، سەر خونچەی دەمی سوور
نــاو قژی خـــاو، سنـــگی بـلوور
نـــاو شەپۆلی گۆرانی خۆش
ترپەی ڕەشبەڵەکی بە جۆش

بۆی، نەدیمەوە شیعری گەش
نە، لەڕۆژا، نە شەوی ڕەش
لە دەمی ئاڵ، هەرچی مژی
هەڵبەستێکە ڕەنگە نەژی
چووم، بۆ لادێ، بۆ ڕەشبەڵەك
بۆ ئەو دیوی سوخمەی خامەك
بۆ ناو ئارەقێك ئەتکێ
لە کوڵمی روومەت ناسکێ
چوومە ناو، دەنگی پێکەنین
گەڕام چۆلیان، ئاسمانی شین
پێوام، کووچە و شەقامی شار
چوومە ناو خۆشترین تەلار
نەم دۆزیوە، تا ئاوری
دڵ فڕێنی کوت و پڕی
نەك شیعرێك، سەد شیعری پێدام
بەمە گەیشتم بە هیوام
تا گوڵی دڵداری راستیم
گوڵی جوانی خۆشەویستیم
نەگەشایەوە، شیعرەکەم
نەهاتە سەر لێواری دەم

هۆنراوە بۆمناڵ

# کۆرپەلەی کوردستان

ئەی کچە نەشمیلانەکەم
کۆرپەلە خنجیلانەکەم
فرمێسکم کرد بە ملوانکەت
پـــەرِەی دڵیشـــم بە لانکەت
لە تیشکی گـــزنـــگـــی زێڕین
بۆم کردی ئەگریجەی چین چین
لە پەرِەی گوڵاڵەی ناسك
گۆنام بۆ کردی تکـــــەتك
شـــەونـــمی دەمـــم پیـــا رژان
ئەی کۆرپەلەی نازدار و جوان
تۆش کە گەورە بووی، بووی بە ژن
ببـــە بـــە شـــانـــازی بۆ مـــن
ئەگەر بۆ کورد، بۆ نیشتمان
تۆ هەوڵ بـــدەیت بێ وچان

ئەگەر وەکـــو مۆمی کافـــوور
ئەی جوانکیلەی گەردن بلوور
بتوێیتەوە بۆ گەل و وڵات
ببی بە ئاگری خـــــەبات
ئەوساکە لێت ئەبم رازی
بۆ کورد ئەبی بە شانازی
من دایکی تۆم بەڵام گیانە
ئـــەم وڵاتی کـــوردستانـــە
تۆی پەروەردە کرد بە جوانی
تۆش سا، ببە بـــە قـــوربـانی

١٩٥٧

# لە زیندانەوە

ئاسمان وەکو کەلە بێژنگ
ئاوات ئەبارێنێ بــە چنگ
بە چاوی خەیاڵ، دوور ( لە دەشت )
کــچان ئــەبینم دێن بۆ ( گــەشت )
سەوزە گیایە، گوڵە، هۆزار
قاقــایــە، تــریقەی نازدار
یادی ئێوە، هــاوڕێینە
لە باخی دڵما شیرینە
* * *

نوێنەکــەم و قوژ بنی ژوور
پەنجەرەی بچکۆلانەی سوور
پــرێمــزی دووکەڵاوی
خولیای شێواو و تەماوی
سڵاوتان لێ ئــەکەن هەموو
لە ئێوە و لە کێڵ و مردوو
لە ئێوە و لە گردی سەیوان
لە گزنگ و لە ئەرخــەوان
* * *

ژیــانــی مــن هــاوڕێینه
وشکه، بیٚ تامه، خەمگینه
ژیانم وەك، یەك گۆرانی
بەشەو، هەتاکو، بەیانی
بەیانیش تا شەو، دیٚ و، درەنگ
کــه هاوڕێکان ئــەبن بیٚ دەنگ
وەك یەك گۆرانیه و بیٚ تام
وەك بەستەی یەکێکی نەفام
سڵاو لە ئێوه و لـه قەڵـبەز
لە ئەزمڕ و دیمــەنــی ڕەز
زیندان ناخۆشە، تەنگ و مات
گەرچی: (وچــانه بۆ خەبات)
بەڵام هەر نوێنه و پەڕۆی خوان
زنجیرەکــەم و نــەختیٚ نــان
- هەزار سڵاو لـه خاکەکەم
کــه خــۆمــی وا بۆ لیٚ ئەکەم

١٩٥٧

# ئاگری قاسپه

کەژی سـەختی بە لێشاوی فرمێسکی ئـاسمـان
روو ڕاکاوو بێ شەقار بـووی ئاوی چەمی خـوڕ
کەژی مـاندووی چۆك دادانی هـەزار هـەزاران
ساڵی پێشووی تەمەنێکی چەشەی خـوێن و گـڕ
ڕەنگ بزرکاو ئەینوارییـە مـەرگـی زەردەپـەڕ
پەلەوەری خـاڵی گـۆنای ئـاسۆیـەکی سـوور
ئەینوارییە تەپوو تـۆزی ڕێچـکـەی ڕانـەمـەڕ
چاو لێك نانی بریسکەی چەم، دێ ی بناری دوور
لـەم کـاتـەدا کـە ئاگری قاسپە قـاسپی کەو
لـە دۆڵەوە هـەڵئەزنا بەرەو لـوتکـەی شـاخ
خـەو پژێنی دەست و پـەنجەی نەرم و نۆڵی شەو
هەر کە جووڵا زرمـە هەستـا، نزیك لێوی بـاخ
کـەو پێکـرا راوکـەری گورج، بە سەربڕین فێر
چەقۆی نایە سەر گـەردنی نـاسـکی پـڕ خاڵ
دڵی کەوی چـرکـەی دوایـی زینـدەگـی ژمێر
دوا تـروسکـەی یـادی رشتە ناو بنێشتە تاڵ
کـە نـوارییە راوکـەرەکـە، هەر ئەوەی پار بوو
ئـەمجارەش یار بە قاسپەی خۆش بەم دەردەی گەیان
بنێشتـە تـاڵ، پار فریای کەوت، کاتێ زامدار بوو
بـەلام تازە بنێشت ناگـا بـە هـاواری گـیان

# سەرنج

سەرنج ئەدەم لە رووی بیٚ گەرد
لـــە تـــەوالـیٚتی جـــوانی زەرد
لە شانی، روومەت، تالّی پەرچەم
مـــانگی گۆناو ئـــەستێرەی دەم
لـــە درزی بـــلوزی تـــەنك
لە تەختی سنگ، دەسی ناسك
ئـــەوی دێتـــە بەرچـــاوی مـــن
گۆڕی، زێڕە و جەرگی کون کون
چونکە هێلانەی گەرمی دڵ
ئەدەن، بە لـــەوێچیٚ خشڵ

# قوببەی هەیاسە

ئەسپەکەم تاو ئەدەم بە گوڕ
بەسەر کەژا، رووباری خۆر
ئێوارەیە، گرد، وەکـــو مس
لە، شنەی بای گەرم وەڕس
مانگ وەك قوببەی هـەیاسەی زیو
ئەگەڕێ، شەخەڵ، دەشت و شیو
هەگبەکەم پڕە لە سووتوو
لە خۆڵی مەچەکی مردوو
مـەتارەکەم پڕ لە ئەسرین
ئەگەڕێم، دڵم کەیلی قین
ئەسپەکەم چوار پەلی وەك خوێن
رەنگی ئـــەدا لـــەگـــەڵێ شوێن
منالْ وەکو پەپـوولەی ورد
کۆمەڵ ئەبەستن لەسەر پرد
بەتاڵی: زەردەخـــەنەی ســـوور
ئەتەنن لێم، پردی رێ ی دوور
دیاریم پێ یـە، خێرا دڕدەن
ئەمرین بۆ ئێوە و، بۆ وەتەن
ئەسپەکەم تاو ئەدەم بە گوڕ
بەسەر کەژا، رووباری خوڕ

# بەهار

بەفری خەمگین توایـــەوە رەنگی گـــوڵـم ناچێتەوە
خونچە تارای سووری پۆشی و گەردنی ناشکێتەوە
وەك چلوورەی رۆژی زستان ئـەم گوڵـەم ناتوێتەوە
تیشکی خۆر وردە، وردە هـەروەکـو ئاڵتوونی خاو
توایەوە، ناو ئاوی چەم، هەستا لـە چەم پرشنگی ئاو
* * *

تاشە بەفری لووتکە هـــەر وەك، لەشکرێك (بێتو) بەزیو
تیشکـــی زێرینی بەهـار، دوای کـــەوتووە بیکا بـــەزیـــو
بیرژێنێتە دەمی چـــەم، رای بـــدا، تـــا جـــەرگی شـــیو
وا گـــولاڵـە شـــەونـــمی نـــواند بۆ مەلانی نـــەرم و نۆڵ
بوو بەئاهەنگ لـەو چیایەی دوێنێ مات بوو، چۆڵ و هۆڵ
* * *

وردە بەفری سێبەری مەڵبەندی بەرز تاسێکی ســـوور
نـــەرمـــە پرشنگی گزنگی تێکەڵاو، وەك ووردە نوور
هەر ئەڵێ ی تاسێکی ئاڵتوونە و لـەسەر گەردن بلوور
سوخمە (گوڵ)، ســـەرپۆش تـــەمی نـــەرمـی تـــەنـك
بوو، بە ملوانکەی ملی کەژ، ئـاوی بەفراو تك بـــە تك

١٩٥٧

# شیعرەکانم

ئەڵێن شیعری من بەتامن
چرۆی درەختی هـیوامن
وەکــو بــەهــار تــــەڕ و بڕن
ڕەنگین و جوان، گەرم و گوڕن
هەیانە، شینێکی کالــە
پارچەی ئاسمانی خەیاڵە
زەردی خەفەتی ژیانــە
سکاڵای ئازاری گیانە
سەوزی کاڵی، دڵداریە
بۆ دڵ جوانترین دیـاریە
سپی تیــایە وەکــو بــەفر
سووریشی وەك گڕی ئاگر
ئەو شیـعرانەی وەکــو پشکۆن
هی ئەم خەڵکە و هی من و تۆن
ئـــەوان نەبێ شیعـرەکـــانم
ڕستی وشەی خۆش و جوانم
هەمووی ئەکەم بە قوربانت
ئەیدەم بە یەك بزەی جوانت

پرشنگی شیرینی گـۆنـات
پەپوولـەی نیگای بێ هاوتات
زەردەخەنەی خونچەی دەمت
بریسك و هۆڕی پەرچـەمت
هەموو شیعـرەکانم دێنن
لـە ئاستی جوانیتا کەمن
کامی خۆشە و تامی تیایە
هەڵبەستێکی بێ هـاوتایە
لـەناو تاڵی تـەوالێتا
ئەتوێتەوە و لـە بەرپێتا
ئەبێ بـە نەختە هـاڵاوێ
ناژی، ئەمرێ لـەدوای تاوێ
بـەڵام هـەمبێ تەنیا شیعـرێ
ئەو هەڵبەستەی بەرگە بگرێ
هەر شیعری نیشتمانیمە
لـەوە بەو لاوە من نیمە

## گوڵ ئەستێرە

گوڵ ئەستێرەی رووی شەوە زەنگ
بریسکەی گەشە رەنگاوڕەنگ
وەك چاوی، گۆنای، یا، گەردن
چەناگەی شیرینی خڕپن
تەزوو، نارژێنێتە گیانی
فریشتەی نازداری جوانی
پرشنگ نادا، لە تافگەی دڵ
کچێ رووی گوڵ و بەژنی گوڵ

*　　*

زەردەپەڕی لێوی چیا
پرشنگی گوڵ و سەوزەگیا
پەلکە زێڕینەی رووی ساماڵ
پڕیشکی زێڕ، یاقووتی ئاڵ
ناگەنە بزەی لێوەکەی
شەوقی روومەتە سێوەکەی

*　　*　　*

سروەی شەماڵ و خوڕەی ئاو
هاژەی قەڵبەزی وەك بەفراو
وەك پێکەنینی بەجۆشی
دەنگی بەلەزەت و خۆشی

پەپوولەی زەوقی سادەی ژین
پیٚ یان نـایــەتــە هــەڵفڕین
* * *

بـەژنی وەك چوزەری ریـٚـواس
دەمی یاقووت، پەنجەی ئەڵمـــاس
دەنگی بەسۆز، نەشمیلە و جوان
فــریشـــتەیــەکی کــوردستان
قژی وەك چەپکیٚ تیشکـــی خۆر
رەنگی تیٚ رژابــوو ســـــەد جۆر
* * *

نایانە، سەر تەختە ســـەهۆڵ
ناو گەرووی ماتەمینی دۆڵ
سەربازی تورکی دڵ ئـاسن
شەیدابوون بۆ خویٚناو رشتن
دوای زیندە بەچاڵ کردنی
هەزاران کوردی وەتـەنی
کچەکەی (دەرسیم) یشیان کوشت
خویٚنی کـــچی شـــەبـــەقیان رشت
نرکانی کچـــەکەی دەرسیم
من هەزار هەزار ساڵ ئەژیم

ئەژیم، لە خاکی خـوێنینا
لە خونچە و سامانی شینا
دەرسیمی وتەی سەر بەرزی
لە ناو، گەرووی کەژا تەزی
دەنك دەنك وەك تەرزەی ورد
با، بردی بە دیاری بۆ کـــورد
ئەگریجەی دەسکەنە کراو
رژایە نـــاو، شەپۆلی ئـــاو
ئەوەتا بەچاوی دەروون
ئەبینم قژی وەك ئاڵتوون
ئەڵێ : ((ئاکامی سەرکەوتن
ئـــالآی کـــوردم پێ بچنن))

گولاڵەی شادیم لە گەشیدایـە
هیچ بایەك نی یە هـەڵی وەرێنیٚ
دڵیشم وەکو پارچـــەی پۆلایـــە
کەس توانای نی یە تێکی شکێنیٚ

شەهید کـە چـاوی ژیانی لێك نا
گـــرِ بـــەرئـــەبێتـــە ولاّتی ئـــارام
دوا گەردشی سوور لـەگەڵ دوژمنا
بە زاڵبوونی کورد ئەگـــاتە ئەنجام

مەولـەوی باوکی هۆنراوەی جوان بوو
تاڤگەی زیوینی شیعـــری رەوان بـــوو
بەلاّم تاکو مرد دڵ تـــەنگ و مەلوول
وێڵ و ئاوارەی تیکـــەیـــەك نان بـوو

## لافاو

ئەی فرمێسکی لێڵ بلەرزە
لە عــەزرەت باران و تەرزە
دیسان هەستی هۆنراوەی دڵ
وەکو مەنجەڵ هاتۆتــە کــوڵ
ئەم جارە دڵۆپی ئەســرین
ئەکەوێتە هەڵبەست چنین
ئێوارە بوو پــرشنگی خــۆر
دوور کەوتەوە لەشار بەزۆر
هــەوری پــایـــزی رەش و زەرد
چین چین ئەنیشتە سەر رووی هەرد
گۆیژە گریا، گریا بە خوڕ
لافاو هەستا بە تین و گوڕ
ئاسمان بەرگێکــی پۆشی رەش
مەرگ ناوشاری گرتە باوەش
خوێناوی شاخی مات، تەزیو
خانووی ڕا ئەدا بۆ ناو شیــو
بێشکەی منالی ئێسك سووك
بوو بوو بە گۆڕێکی بچــووك

وەکو بەلەم لەسەر رووی ئاو
ئەڕۆی بەرەو نەمان، بەتاو
پرچی (سپی) دەسك دەسك
لەگەڵ گۆناو دەمی ناسك
ئەڕژانە ناو جادە و کۆڵان
دار و دیوار، بەرد ئەگریان
دایك ئەیزیڕان بۆ منداڵ
منداڵیش (پارچە گۆشتی کاڵ)
کەوتە ژێر دار و پەردوو
شین بۆ (هەموو) نەك کەس مردوو
لەمەشا تۆ تیا چووی هەژار ؟
ئاخ لەخەشی هەورو زۆردار!!
خانووی گڵی کۆڵانی تەنگ
ئەکەوتە ناو گۆماوی مەنگ
کە پەنگی ئەخواردەوە ئاو
ئەیزریکان سوپای لافاو
ئەینەڕان بەسەر شارا، شار
ئەکەوتە قریشکە و هاوار
لاوێك، تا دوێنێ بوو، دڵخۆش
پەری هیوای گرتبووە کۆش

خـۆی دانــابوو، بڕوا بۆ دوور
( بۆ خوێندن) بەڵام ئاوی سوور
لەگەڵ دایکیا دەست لە گەردن
هەڵی لـــووشین ئـــاوی مـــردن
(کامیل): ئەی کوڕە شەنگە کە
(کامیل): لاوە بێ دەنگــە کـــە
چۆن؟! تۆ ئێستە چویتە ژێر گڵ
دەك کوێر بن ( پایز یشو گوڵ)
ئەو گەنجە، ئەو کوڕە جـــوانە
ئێستە لـــە ســـەیوان مـــیوانە
ئاخ ئەیویست سبەینێ بەیان
بڕوا بۆ خوێندن لاوی جوان
چاوەڕێ بوو، دوا ڕۆژی گەش
(کامیل) گیان بگرێتە بـــاوەش
دڵنیا، چـــاوەڕێ بـــو لاو
بڕوا بۆ خوێندن ئاخ لافاو!
لە پڕ ورووژمی بـــرد بۆ ژوور
مرد، ئاواتی گەش ( بێ سنوور)
مرد" دڵێك و گیانێك، دەروون
دوا ڕۆژێکـــی شـــیرین و روون

ئێواره بوو، پرشنگی خۆر
هەور دایئەپۆشی بــه زۆر
لاوێکی بەسزمان هــــەژار
کەوتە بانگ کردن و هاوار
بەڵام چی!! دوای یەك هەناسە
ئەو بەسزمانە کــەســاســـە
چووە سەر لاشەی دوو منـاڵ
گــریــا بۆ ژینی رەش و تــاڵ
لاشەی منالانی هــــەردوو
دەرهێنا لە دار و پەردوو
مرد" زەردەخەنە و چاوی جوان
مرد" دوو منالی بـــەســــزمان
ئێوارەبوو، لێشاوی ســـوور
هەر لاشەی ئەهێنا لە دوور
دەمێك، سەرێك و پـرچی زەرد
تاوێك دەست و پەنجەی بێگەرد
یـــان لـــه پڕ پیرێکــــی بیٚ هێز
(ئیختیاری ئەکرد لیٚ ی گورێز)
پەلامــاری ئــەدا بــۆ گــۆشت
( گۆشتی منال خۆشی ئەڕۆشت)

مردن ئـەیگێڕا، زەمــاوەن
ئەگریان هەژار، دەوڵـەمەن
دەرگای ئاسن، دیواری زل
بەرەو شیو ئەڕۆیشتن بە تل
پەنجەرە و پەردە و چاوی کاڵ
ئەگریان بۆ نەختێ ســامــاڵ
تــەرزەی رەقی دەنك گەورەش
بە (سلێمانی) ئەڕشت خــەش
ئـەریێ پــایز، ئــەریێ بــاران!
بۆ قارت گرت لـە کوردستان؟
ئەریێ هەوری مات و بــەسام
بۆ راتداین وەك پەلاش، نەمام!
شەوێ، ئەسووڕاینەوە لاو
بازوومان بۆ کار هەڵکراو
چووینە کۆڵانێك هــاژەهــاژ
ئاو لاشەی کردبوو بە (کاژ)
کوڕێك هات شەل، گاڵۆك بە دەس
بــانــگی کرد: هاوار (لافاو) بــەس
تۆ خوا خەڵکی ئازا وەرن
ئەم خانووەم بـۆ هەڵگرن

کچەکەمی تیایــە هــاوار
کچێکی ناسکۆڵە و نازدار
یــەکــێکی تــر هــاواری کرد
سێ خۆشکم، دایکم، باوکم مرد
ئاخ خوشکی کەساسینە، من
چی بکەم لەگەڵ هێزی مـردن
ئەمویست بە سواڵیش بوایەگەر
بەخێوتان کەم، تا مـردن (هـەر)
بۆ رۆیشتن، لەتاو برسێتی
بۆ نان؟ ها گــریانم برێتی
ئاخ هێلانەکەم شێوا، رما
بەیاخی (یەئسم) هەڵکـرا
کچێکیش شۆخ چواردە ساڵان
لە ژوورێکا خنجیــلە و جوان
ئــەینـــواریـە باخی خــەیاڵ
دوا رۆژی خۆش و ئاسۆی ئاڵ
نوێنی بوو بوو، بە گۆڕ و مرد
ئاخ لافاو چی بە ئێمــە کـرد؟
نـابێ شاری پیرۆز و جــوان
ساڵێك دڵخۆش بێ ، بێ زیان

یا لافـاو، یا بـۆمبـــا بـــاران
یا لـێزمەی گولـلـەی بێ وچان
ئەبێ ساڵی جارێك ئێره
وێران کا، بیکا به گێره
ئەبێ شینێك هەر ساز بکا
خەڵکی وا پەرەواز بکـــا
دەرگانەی شـــادی داخا
ئالآی ڕەشمان بۆ هەڵ بکا
نیوه شـەو بوو دەنگێ هەڵسا
بـــانگی بەنـــاو شارا ئـــەدا
ئەیوت: (ئەوی، ماڵ وێرانه
روو بکاته خەستـــه خـانه)

# جەمیلە

ئـــەی جـــەمیـــلـــە....
سلاو، لـە ئاگر و ژیلە....
لە حەیرانا، لـە لاوکـا
کاتێ کچ لـەگەڵ باوکا
هەڵمەت ئەبەن بەرەو مردن
بەرەو قەلای سەختی دوژمن
لـە هێرشی سەرکـەوتنا
لـەکاتی بۆ (گەل) مردنا
کاتێ لـە نزار، لـە مەڵبەن
ئەمـانسووتێنن بۆ وەتـــەن
ناوت وەکـو وشەی نەمر
ئەڕژێتە ناو گەرووی ئاگر
ئـــەی جـــــەمیلە....
سلاو لـە ئاگر و ژیلە

لەسەر، زنجیرەی گرد.. چیا
لەو شوێنەدا، مانگ بە تەنیا
ئەنوارێتە خوێناوی گەش
زامی دڵ ئەگرێتە باوەش
بە تیشکی سووری ئاگـرین
با، وێنەی تەورێك بكێشین
وێنەی تەور و، دەس و بۆمبا
وێنەی رووی جەمیلەی ئازا
با، لە دەربەندەکەی بازیان
کە دوژمنی کورد ئەگریان
لەو شوێنەدا، شوێنی هەرا
کە ئالآمان (تیا هـەڵکرا)
با، لە چیا، لە شیو، لە هەرد
(جەمیلە) بنووسین لـە بـەرد
وەرن، با، بـە سـروودی ئاڵ
لەگەڵ سۆزی گەرووی شمشاڵ
زیندان بێنینە لەرزە و جۆش
راپەڕێنن شـاری خـامۆش

ئەی باڵندەی هەستم بە گوڕ
بفڕە بۆ ناو، بلێیـــــە و گــڕ
بۆ (جەزایر) خاکی ژیلە
بڵێ بە خوشکە جەمیلە
( سلاوی گردەکەی سەیوان)
(سلاوی گــەرمی نیشتمــان)
پێشکەش بە تۆ، ئەی کچی لاو
ئەی پەروەردەی گــڕ و خوێناو
ئــەی جــــەمیلە...
سلاو لـە ئاگر و ژیلـە

* * *

لـە هەمـوو شوێنی کوردستان
بــاسی تۆیــە ئەی قارەمــان
چونکـە کچ و کوڕی ئێمەش
کە، روو، ئەکەنە گڕی گەش
نــاترسن وەکـــو تۆ ئـازان
لـە مەرگ و سزا، بێ پەروان

(کچەکەی نـــەغـــەدە بـــەخشی)
( بۆ کورد هەردوو چاوی گەشی)
ئـــەی کـــیژۆڵەی بۆمبـــا هـــاوێژ
بانگ ئەکەین: (زۆرداری خوێن ڕێژ)
نەکەی دەس و پەنجەی مردن
(تەور) درێژکەی بۆ گـەردن
(تاوانبار، دانیَ، تەورەکـەت)
ژێر ناکەویَ هێزی میللـــەت
ئەی خاکی ئاگر و ژیلە
هەزار سڵاو لە جەمیلە

# دڵ کرد

هۆنراوەت بۆ ئەڵێم بە تام
پڕی بێ لە تەزووی ئـارام
بریسکەی لێ بێ وەکو رووت
ورشـەدار بێ وەکو یاقـووت
تۆش هۆنراوەی وا هونەرچن
بهـۆنـەرەوە بـۆ گـەردن

* * *

هۆنراوەم هەیە، وەك کوڵم
گەشە ئـەی نـازداری دڵم
گیانەکەم من پێت ئەبەخشم
هۆنراوەی وا جوان و گەشم
تۆش دەمی بنێرە سەردەم
با گەشتر بێ هۆنراوەکەم

* * *

ئەتدەمێ خۆشترین هەڵبەست
ئـاو بزێنێتە دەمـی هـەست

خۆش بێ وەکو چرپەی دەمت
لای بــەرێ لـــە دڵتا خەمت
کەی تۆ بە تاسەوە مژیــت
ئەڵێم ئەی هۆنراوە ئەژیت
* * *
هــۆنراوە ئــەڵێم بۆ باڵات
بۆ سنگی بەرزی بێ هاوتات
تۆش ئاوریشمی هۆنراوەی جوان
لەبــەر کــە ئەی پــەری ئاسمان
هەرچیم هەیە هۆنراوەی ورد
بەرهەمی شیرینی (دڵ کـــرد)
ئەیبەخشم بە لار و لـەنجــەت
بە ناسکی ی دەس و پەنجەت
تۆی هۆنراوەی ژیانی من
ژیانی شیعــرەکانی مـــن

# باخی بەژن

تا چاو بڕکا دەشتی دەروون هەر گوڵ بوو
پـــەری شادی و پێکەنین ئاشنای دڵ بــوو
لەسەر پۆپەی دارگوڵی هۆنراوەی جوان
لـــەنـــاو بـــاخـــی شیرینی بەستەی نیان
لەژێر سایەی درەختی میوەی وشەم
هۆزاری دڵ ئەیرِشت ئاوازی تاسەم
لەبەر تاڤگەی ئەگریجەی زەرد و خاوا
لەگەڵ شنەی پەپوولەی نیگای چـاوا
لەناو ورشەی کانیاوی چاوی کاڵا
لــە سێبەری گــوڵزاری لێوی ئاڵا
لەسەر تەختی ناسکی بەفری سنگا
لـــە بـــاوەشی بزەی وەکو گزنگا
هەنگی چاوم خەریکی گوڵ مژین بـوو
هەر گوڵێکم ئەدی لای من شیرین بوو
رووناکایی شەوم تریفەی سنگ بوو
بەیانی من قۆڵی مەیلە و گزنگ بوو
کۆرپەی عەشقی تازە گڕوگاڵ گرتووم
خـــونچـــەی تامی ژینی تازە پشکوتووم
ئەویان گۆشی شیری پەریی جوانی بوو
ئەمیان گەشی سروەی بای نیانی بــوو

چاوی خۆزگەی نمی ئەسرین نەڕشتووم
دڵی تاسەی تامی خەفەت نەچەشتووم
هەر گەڕان لەژێر چارشێوی ئـــەرزا
بۆ لەرەی لەش لە باخی بەژنی بەرزا
بۆ ئـەو دەس و پەنجانەی سپی و نـــەرمن
بۆ ئەو کوڵم و چـاوانەی گۆشی شەرمن
دەمێ کەژاڵ، باریکەلەو کـــەمـــەر تەنگ
دەمێ خرپن، گەنم ڕەنگ و شۆخ و شەنگ
دەمێ مناڵ، ناسك وەك بووکی ڕێواس
دەمێ، کچی، شۆخی ناو گوڵزاری ناز
تا چاو بڕکا دەشتی دەروون هەر گوڵ بوو
پـــەری شـــادی و پێکەنین ئاشنای دڵ بوو
بەڵام مـــەلی تینـــووی سەرنجی جوانی
هەر تینوێتی نەشکا، هەرچەندێ ڕوانی
نە هۆنراوەش گەیشتە ئەو چیایە
کە کۆتایی باسی دڵداری تیایـە
دڵیش هەروا هەرچەندە گەردی پیری
یا تۆزی خەم، تۆزی ئاغـــری و ژیری
لێ ی نیشتبێ هێشتا هەر تەڕە وەك گوڵ
کـــەی تێر ئەبێ لە پـــەرستن عەشقی دڵ

# سوخمه

وتی: سوخمەی ئاوا تەسك
قـومـاشەکەشی وا نـاسك
بۆ سنگم نابێ، زوو ئەپوێ
بۆم بدروو یەکێکی نــوێ

*

-: مەگەر هی زیوو ئاڵتوون چن
بشـــێ بـــۆ سنـــگی وا خـــرپن

*

شەرمی رشتە سەر خونچەی لێو
سووی لە ڕوومەتی وەکـو سێو
بـــە نـــازێکەوە وەکـــو بووك
وتی سوخمەی تەسك و بچووك
بۆ سنگی وا بەرزو گـــۆشتن
نابێ ئەی دەستە خوشکی من

ئەمە دوو سەخمەت بۆ درووم
نە گونجان لەگەڵ ئارەزووم
ئەمجارە لەسەر ئەندازە
بۆم بدروو سوخمەی تازە

*

دەستە خوشکی سوخمە درو
مەست بوو بە جوانیی سنگ و روو
ئەمەندەی نوارِی یە سەر سنگ
کوڵمی گوڵ و پرچی گزنگ
ئەمجارەش ئەندازەی شێوان
تێك چوو سوخمەی کچۆڵەی جوان

١٩٦٢

# دڵی گەشاوە

خونچەی دڵداریم گیانە ژاکابوو
تاکو هـەناسـەی تۆ گەشانێوە
زۆر چقڵ هەروا دڵمی پێکـابوو
تا، دڵ نەرمێکەی تۆ بووژانێـوە

*　　*　　*

بە، پەنجەکانت، زامی پڕ لـە سوێم
سارێژ بوو دڵـم کەوتە شـنەشن
بۆیە، پەپوولـەی هەستی ژینی نوێم
بیری چۆتەوە، سزاو خـەم چەشتن

*　　*　　*

لـە ئاسمانێکـدا رەنـگ پیرۆزەیی
گیانی دڵداری من لـە گەشتایە
لە خۆشی گۆنای گەشی پەمەیی
هەمیشە ئەڵێ ی لە بەهەشتـایە

# تۆسقاڵێك لە دڵم

ڕاتگرت، گەردنی شەرمت لار
داوات کرد ئەی کچی نازدار
بۆت بڵێم شیعرێك بە جۆش بێ
ئێجگار بە لەزەت و خـۆش بێ
باسی گۆنات بێ هی پەنجەت
هی باڵاکەت، لار و لەنجەت
ڕوومەت و سنگ و چاوو دەم
سەر لەوحە بن بۆ شیعـرەکەم
بەڵام لە کوێ بێنـــم شیعرێ
وەسفی شێوەی تۆ هەڵبگرێ
کوا شیعرێك وەك قژی خاوت
وەك پرشنگی نیگـای چــاوت
وەك لەرینی کوڵم و سنگت
خونچەی دەمی پڕ ئاورنگت
وەك تۆ جوان و ڕەنگاو ڕەنگ بێ
وەك بەژنت وا شۆخ و شەنگ بێ

گیانه، شك نابەم لـە لام بێ
دێڕێك پڕ لـەزەت و تام بێ
شیعرێك بێ پڕ مۆسیقـــا بێ
دەنگی بە جۆشی تۆی تیابێ
جگە، لـەمەش ئەی روومەت گوڵ
(شیعـــر تۆســـقاڵێکـــە لـــە دڵ)
کـــەواتە، هـــا دڵی ئـــاگـــر
لە جیاتی یەك دوو دێڕ شیعر

١٩٥٨

# سەوزی کاڵ

ئەی گوڵی سووری باخـــی گیان
لـە، شیعری سەوزی کاڵی جوان
گەڵای پـاراوم بۆ چنیت
تۆ ئیلهامی شیعری منیت
لـە، تاڤگە، لـە کەژی بەفرین
زەردەپەڕ، قەڵبەزی زیـــوین
خونچەی ئاڵ، چرۆی تەڕ، پاراو
شەونم، بریسکـەی خـــۆرەتـــاو
شیـعری شیرینم بۆ مـــژیت
تەنیا، تۆی، لـە دڵما ئەژیت
چیم، زانی لـە، وردەکاری
لـە وەسفی جوانی دڵداری
هەمووم کـــرد بە شیـــعر بۆ تۆ
بە هۆنراوەی گەش وەك پشکۆ
لـەوە زیاتر هیچ نازانم
بۆیە سستە شیعرەکانم
مەگەر چاوەڕێ بێ جوانی
پیریت بکەم بـە گـــۆرانی

# لار و لەنجە

ئەی لار و لەنجە، تۆ تەلیسمێکی
تەزووی ئاگرین ئەنێیتە خوێنم
وەك ورووژمی تیر، دڵم ئەپێکی
ئەرێ کچی شۆخ چۆنت بدوێنم

* * *

تا، ئەو، ئاگرە لەناو لەرینی
سنگی نەرمابێ ئارام ناچێژم
کاتێ کە قۆڵی شل ئەجووڵێنی
نم نم فرمێسکی تاسەم ئەڕێژم

* * *

کاتێ ئەتبینم، سەرنجی چاوم
ئەچەقێتە سنگ، پێستی ناسکت
لانکەی ئاواتی دڵەی سووتاوم
ئەجوڵێتەوە، لەگەڵ باسکت

# تیشكی چرایەك

كچی نەرمۆڵەی شۆخ و شەنگ
بەرگیان پۆشی هی رەنگاوڕەنگ
ئارایش لەسەر تەختی روو
لەتاو جوانی شەرمەزاربوو
گەردانەی زێڕ ئاڵا لە مل
پشتێن گوشی كەمەری شل
شەرم، ئەڕژا، لە ورشەی چاو
بریسكە لە ئەگریجەی خاو
ورشە لە كەوای سورمە چن
پرشنگ لە كوڵم و لە گەردن
بۆنی رێحانە، لە، پەرچەم
بۆنی گوڵە عەتریش لە دەم
دەس كە چەند جوان و خرپنە
نەخشاندبوویان بە خەنە
خەرمانەی دەوری كوڵمی سوور
لە تەمی تارادا، وەك نوور
بووك گەیشتە ژووری تەلار
دەورەیان دا كچی نازدار

جوانترین شتی جوان، دەگمەن
لــە ژورێکــا ئــاوێنــە بــەن
جوان رێکیان خستبوو بۆ بووك
بووکی نەرمۆڵەی ئێسك سووك
پۆپە شمین و پەردە و گوڵدان
فەرشی رەنگاورەنگی کاشان
نەخشێکیان کێشابوو ئێجگار
جوان بوو وەکو باخی بەهـار
دڵــی زاواش پــیری تــەرپۆش
هەر چاك بوو نە ئەبوو، بیَ هۆش
زاوا پۆشیبووی جلی جوان
سەری تاشیبوو، بە گوێزان
لــە پێوە، تــا مشــکی و کڵاو
هەمووی تازە و، ورد، رێکخراو
چاکەتەکەی وەکو جاران
نەیبوو پینەی سەر ملیوان

کچێکی هەبوو، جوان، شیرین
خوێن گەرم و شۆخ و نازەنین
بەڵام دایکی ئەبوو.... دە ساڵ
جیّ ی هێشتبوو، ژیانی ماڵ
لە، ژێر، سایەی ئەرخەوانا
راکشابوو، لە، ســـــەیوانا
باوکی... (ئەم بووکەی) کە هێنا
چـــــوارەمینی بـــوو لــــە ژنـــــا
* * *
شەو هات و بیّ دەنگی بە سام
کشایە ناو کوچە و شـــەقـــام
مانگ ئەینواڕیە پشت پەردە
رووی ئەو شیرینە بیّ گەردە
ئـــــەینواڕیە بووکی وەك گـــوڵ
- پیری ژین رۆشتووی بەرەو گڵ -

ئـــەینوارِییە بەفر و ئاگـــر
کچ پشکۆ بوو پیرەش بەفر
هەر پارە بوو هۆی ئەم کەتنەش
( سامان بووکی گـــرتە باوەش)
لــــەم بەرەوە، رۆژێکی تـــەنگ
وەکو شەو خەمگین و بێ دەنگ
کچەکەی حاجی (بەسزمان)
سەرنجی ئـــەدا لـــە ئـــاسمان
دوای هەناسەیەك بێ دەنگ بوون
ئـــەسرین زایە ناو چـــاوی روون
چاوی لێڵ بوو برژانگی ورد
پـــەنایان بۆ یـــەکتر ئەبـــرد
دایمالّی بەرگی سووری کاڵ
نوارِییە کـــولّمی خـــڕ و ئاڵ
دوو دلّـــۆپی لێڵ لە ئـــەسرین
لەسەر گۆنای سوور ئەلەرزین
کە نوارِیە سەر سنگی رووت
دلّی (خۆشی) بۆی ئەبزووت

سەیری پووزی ئەکرد... ناسك
شووشە بوو مەچەك و باسك
کە کەمەری شلی گووشی
پەنجەی نزیك پەنجەی گەیی
هاوارە، خوای شیعری بەجۆش
هەر ئەم جارە شیعرێکی خۆش
ببەخشە بە شەیداکەی خۆت
تا ماوم کڕنوش ئەبەم بۆت
سووتام، سا، دەی فریام کەوە
ئـــەم شیـــعرەم بـــڕازێنـــەوە
کچی بەسزمانی خەمگین
ئەیڕشتە چنگێوە ئەسرین
وەکو هـــەڵیگرێ بۆ یـــاد
( بۆ ڕۆژێ کچ ئەبن ئازاد)

گـــڵۆپی كـــوژانـــەوەو.. تیشك
دەركەوت، لـە كوڵمی بە پریشك
دایگیرسان (چرایەكی كز)
نـــوارپـــــە سروشتی پـــایز
دوای هەناسەیەك بێ دەنگی
دیســـــانـــەوە بـالآی شەنگی
وەك شۆڕەبی كەوتە لـەرزین
چەپكی ئەگریجەی ئاگـــرین
بەسەر سنگی نەرمیا رژا
بە كوڵ دیسانەوە، گریا
سنگ قژی ئەگرتە بـــاوەش
وەك بگری بۆ دڵی بێ بەش
بۆ ژینێك لـەگـــەڵ بـــاوەژن
كە، هەر، خەمەو سزاچەشتن
خـــوازبێنی ئـــەوەنـــدە كـــرا
تا هیچ كەس هیوای پێ ی نەما
باوكی زاوایەكی ئەویست
زێڕی بۆ بهێنێ بـــە مست

حاجیەك بێ وەك خۆی.. (دەس بڕ)
هەر پارە، بوو، لە لای ئـــەو کوڕ
تا، ئاوا، دڵی کچەی کـــوشت
شەوو، ڕۆژ، فرمێسکی ئەڕشت
میرزا، خۆشی ژن لەسەر ژن
ئەیهێناو تـــووشی ئەکـــردن
حاجی ی  بە (درۆ) لە خوا ترس
کچەکەی لە (ژین) کرد، وەڕس
* * *
کچی جـــوانی تا بڵێ ی شـــەنگ
لە پڕ، هاتە گوێ ی،  ترپە و دەنگ
کــە، نواڕیە، بەر پەنجـــەرە
سەیری کرد، کوڕە نۆکەرە
( بیری خەفەت و ((ژێرکەوتن)) )
– خولیای چەشنی تۆڵە سەندن–
ورووژمێکیان بردە سەر گیان
یەکسەر لای تاریك بوو ژیان

بانگی کرد، (وەرە)، وەرە لام
من لەگەڵ تۆمە،... ئەی نەفام
حەپەسا، نۆکەری هەژار
- بۆ بانگی کرد کچی نازدار!!؟
چووە، لای، دی کچی کەژاڵ
نیوەی سنگی، سەر شانی، باڵ
رووتن، کافورێکن سپی
تێکەڵ بە، رەنگی پەمەیی
کوڕ، هەردوو، چاوی دانەوان
وتی: فەرموو، خانم (فەرمان)
دوای، رێ، پاك کردنەوە، ورد
خانم دەسی بۆ دەسی برد
نایە، سەرسنگی ناسکی
کوڕەی هەژار داچڵەکی
دەسی دوور، خستەوە، لە سنگ
بەڵام کچەکە، وەك پڵنگ
پەلاماری داو توند گوشی
وەکو شێت، گرتیە باوەشی
ئەو، شەوە تا، مەلا بانگدان
مایەوە لەگەڵ کچی جوان

کـە بەیانی هەستان لـە خـــەو
کچە، بە کوڵ گریا بۆ (شەو)
هاتـــە، بـــەرچاوی کە چـــۆن ژین
یەکسەر لیّ ی بوو، بە گریە و شین
چۆن تەختی سەر بەرزیی، ژیان
کـــــەوتە ناو گێژاوی نەمـــان
قیژانی: چی ئەکـــەی لـەلام؟
ئەی سپڵەی نمەك بە حەرام!؟
پەلاماری دایـە، چەقۆ...
نەڕانی: داوێن پیس مەڕۆ
بەڵام کوڕەکە، بۆی دەرچوو
کچەش خوێنی زیاتر هەڵچوو
لـەسەر، پلیکانەکە چەقۆی
دا لـە سنگی ناسکی خـۆی
مـرد، کچێکی وەکو پەری
(ئاوات) و (خەمی) هەڵوەری
بـــاوکی لـە پەردە، هاتـــە دەر
وتی: چی بکەین لـەگەڵ قەدەر.

# هەستم

لەسەر لێوم زەردەخەنەی گەش و جوان
خوای دڵخۆشی رایئەژەنێ بـە نـەرمی
بۆیـە دڵم قەت، مـل نـانێ بۆ گریان
پێ ئـەکەنێ بە جۆش و کوڵ بە گەرمی

لە نـاو گـوڵا، بریسکەی نەختێ ئاورنگ
ئەبێ بـەهۆی دڵخۆشی و کـامەرانیـم
دیمـەنی جـوان بریسك و هوورِی گزنگ
بۆم دەرئەخەن، کەمن چەند شەیدای جوانیم

تـا، بـارانی خەمی ژینم بە تاو بێ
بزەی دەمم وەکو پەلکـە زێرِینـە
دەرئەکەوێ و قیبلەم ئەبێ هەتاو بێ
نیشانەی تیری ژەهـراوی ژینـە

جەژنی ئەم ساڵمان دڵ تەنگە، ماتە
( تۆماری یادی هەوڵ و خـــەبـاتە)
نیگارێکــــی وای بۆ کــورد هێناوە
کە نەخشی هەموو ئەشك و خوێناوە
نیگـــاری دار و کـــانی یـــەك لـیخـــــن
کوردێك لەسەر دار روو بەرووی دوژمن
خوێن تێکـــەڵ ئـەکا بە ئاوی کانی
خۆی ئەدا بە کوشت بۆ کوردستانی
( دڵ بە کوڵ ئەڵێ ئەی کوردی زیندوو)
( لەبیرتان نـــەچێ جـــەژنـــانی پێشوو)

## یادێك

یادی وەکو شووشەی شکاو
لــەدڵمــا ئــــەجوولێ نەرم
بـــــریسکەی خوێنێکی ڕژاو
ئەدا بە گیان کسپەی گەرم

بــەیانی بــوو مــناڵـــی ورد
لەسەر تەختی سنگێکی ڕووت
لێیان ئەنیشت ڕەنگی گۆگرد
کاتێ پەنجـــەی تاوان بزووت

گرمــــــەی بۆمبا ژینی شێوان
ســـەمتـــووری پێکەنین شکا
لەگەڵ دەنگی شین و گریان
خـــوێنی ئـــارامـــی دڵ تکا

دیمەنی خوێناوی بەســـام
دڵـــی منالآنی داخ کـــرد
بە دەستی دوژمنی هیوام
گەلێ منالّی ســاوا مــرد

ریز بن: سنگی ئێوە و تفەنگ
مل کەچ بن بۆ هێزی کوشتن
کوردینە بە (ریز) بەبێ دەنگ
وەرن بۆ بــەردەمـــی مــردن

یادێ وەکو شیری ئاگر
ئەدا لـە درەختی هەستم
یادێکی خەمگین و نەمر
چنگ ئەنێتە دڵی پەستم

ئەوی مێژووی کورد بخوێنێتەوە
ئـەڵقـــەی زنجیرەی بهۆنێتەوە
تێ ئەگا هەرگیز سەر نانێتەوە
هیچ هێزێك نی یە بیتوێنێتـەوە
ئـــەو چەرخە نەما درەختی رەگەز
ریشەی دەرکێشن هی ئێمەی نەبەز

کەژ بەرگی تەمی خەمی پـۆشیوە
هەوری رەش شەوقی کەلی نۆشیوە
تـــا بـــارانـــی ئـــاڵ نەبارێتـــەوە
ئەم هـەورە هـــەرگیز نارەوێتـــەوە
گوڵیش تا دڕکی سزاو زۆرداری
ئـــاوا داپۆشێ نـــاگـــەشێتەوە

# نیگایەك

کاتی جیابوونەوە،... نازدار
سـەرنجێکی دامیٚ ئـاودار
سەرنجێك پڕی بوو لە تام
لە، تەزووی شیرینی هیوام
لـەم جیهانە بەرینـەدا
لەم شوێنە زەرد و شینەدا
نازانم سـەرنجی گـەرمـی
تیشکی گۆنای گەش و نەرمی
کە چەند جوان و بەهادارە
لای دڵی من چەند نازدارە
لەکوێدا هـەڵی گـرم مـن
لە کویٚ ئەی دڵی پڕ لە کون
کوا، شوێنیٚ دیبیٚتی رووی خۆر
دووربیٚ لە خـەم و لە ناسۆر
شوێنیٚ بیٚ سـەرنجـی ووردی
نیگـای نـازداری بیٚ گەردی
تیا دانیٚم هـەتاکـو مردن
لە کویٚ داینیٚم؟ نازانم من
ئەو سەرنجە چۆن لە ژینا
لە، ژینی منی خـەمگینا

لە، ناو، شەپۆلی خەفەتا
لـــە، ژیانی پڕ مـــەینەتا
ئەتوانیێ بژی و قەت نەمریێ
لە ناسۆرا بەرگـــە بگـــریێ
نیگای لە ژوور سەرم، بیێ دەنگ
وەکو، پەپوولـەی رەنگاوڕەنگ
لە باخی دڵـــداری ژینا
وا، لە جۆشی هەڵفڕینا
لە هۆنراوەی رەنگاوڕەنگا
لە بەستەی پڕ لە ئاهـەنگا
هەتاکو، دنیا، دنیایە
ئـەیپاریێزم ئەو نیگایە
نامـەویێ یاقووت، تاجی جـــوان
مرواری و زێڕ، کۆشك و سامان
ئەمانە، لای من بیێ نرخن
بەتەنیا، نیگای ئەوە، من
بۆی شەیدام، پەرۆشم هەرگیز
ئای بۆ نیـــگای گـەرمی ئازیز
( با بیکەم بە ملوانکەی گیان
بیکەمـــە گـەردنی ژیان) [1]

---

[1] هۆنراوەی ( رابندرانات تاغوور) ی شاعیر و فەیلەسوفی بزورگی نەمری (هیند)ە، بە دەسکارییەکی کەمەوە وەرگێڕدراوە

# گوڵە باخ

لۆمەی زۆر دڵدارم ئــەکرد
بۆچی خۆیان بەم دەردە برد
تــاکــو دڵداری نوانی پێــم
ئەی کیژۆڵە پیێ ی لێ ئەنێم
هەر بە یەك سەرنج یەك ئاورِ
بــەرت دا لـــە دەروونم گـــڕ
ئەی فریشتەی تاسە و مەبەست
هەردوو مەچەکی منت بەست
تــا دوێنێ بوو قــوتابی بــووم
ئێستە مامۆستای عەشقی رووم
شیعرت بۆ رێك ئەخەم سیخناخ
لـە وەسفی جوانیت گوڵـــە باخ

ئەمڕۆ کە جەژنە ئاگری ئاڵتوون
فریشتەی هیــوای دڵی ســووتانم
ئــەو درِنــدانەی بۆ پارە مردوون
خونچەی سەربەستی دڵیان وەرانم

کەلەپچە کەتمان وا پسان دوژمن
پەتی قەنارەت نــاگاتــە گــەردن
جەژنی لاوانــە، جــەژنی ئازادی
بۆ هەموو گەلێ، دوا رۆژی شادی

## گیڤارا

لە دەشتێکا دەمەو بەیان
بە سروەی شەماڵی نیان
کاتێ گوڵ کـەوتــە شنەشن
بزووت دەس و پەنجەی مردن
(برادۆ)ی پــەروەردەی تاوان
لەسەر پیلکە پەنجەی جووڵان
خوێنی دڵی گیڤارای رشت
گەورەترین دلێری کوشت
رۆژ گیڤارای گرتە باوەش
بە پۆپەشمینی خوێنی گەش
بە تیشکی گەرم و پڕ جۆشی
تــەرمــی پــیرۆزی داپۆشی

* * *

ژیان بە هاژەی رووبــاران
بە خرمەی رەهێڵەی باران
بە وژەی باڵی پەلـەوەر
گریەی منالی دەربەدەر
بە نیلە نێڵی ئــاگــری
شۆڕشی وڵات پەروەری

به دوا وتــاری گــیڤارا
لە چیاو کــەژ و نــزارا
خۆشترین ئـاوازی دانــا
لە خەبات و کۆڵ نەدانا
* * *
دەنگی چەکوش لـەسەر دەزگا
نرکەی دلێر لـە رووی مـەرگا
ورشەی داسی برای وەرزێر
گرمەی دەنگی رۆڵەی دلێر
ئەلێن گیانی گیڤارایە
لە کەژا لە نزارایــە
ئەرجەنیتن ئــەڵێ گیڤارام
رمانی قەڵای ترس و سام
هەڵمەت بەرن پــەلامــارە
لەسەر رێ و شوێنی گیڤارا
* * *
لــە پــۆلیڤیا پێشمەرگــە
ئەڵێ هەرکەسێ بە جەرگە
خێرا دەست بــداتــە تفەنگ
بەرەو کۆڕی کوشتار و جەنگ

بۆ ئامانج و تۆڵە سـەندن
لە هێزی زۆردار و دوژمن
بـا بـە تـاو ئاسمانی ژیـان
خوێنی گەش و پاکی لاوان
بـۆسـەر وڵات ببـارێنـێ
تا گەل تۆڵەی خۆی ئەسێنێ
کۆڕی کوشتار گەرمتر بێ
وڵات با هەمووی ئاگر بێ
ئەسرین کە دێت جۆگەی خوێناو
نەیەیتە بـەر پـەرژینی چـاو
بۆ پێشەوە سەرکەوتنە
ئازادی و تۆڵە سەندنە
بـۆ وڵات و گیڤارایـە
گەل لە کۆڕی کوشتارایە
* * *

ئـەی تێکـۆشەری سەر زەمین
ئەی رۆڵەی خۆشەویستی و قین
شـانـازی وڵاتی شـەکـر
پێشکەشت بێ چەپکێ شیعر

شیـــعری ولاّتێکـــی وێران
منالّی برسی و سەرگەردان
ولاّتی ئاگر و ئاســـــن
کوردستانی پیرۆزی من
* * *

گیڤارا چۆن وەرزی بەهار
ئەبێ خاك پڕبێ لە گولّزار
یا پایز و چلەی زستان
ئەبێ هەر داکاتە باران
تۆش شۆڕش بووی لە هەموو شوێن
رۆلّەی ئاگر بووی، رۆلّەی خـــوێن
هەر کــە ئـــــەوترا گیڤارا
ئەمدیت لە کۆڕی کوشتارا
بانگت ئەکرد: ئادەمیزاد
ئەبێ بژی شاد و ئـــازاد
دوور لە سزا و لە ئازاردان
لە چەوسانەوەو لە تـــاوان
گیڤارا شیعری گـــڕاوی
وشەی پیرۆزی خوێناوی

لەسەر وێنەکـەت ئەنووسم
لە چوارچێوەی یادی ئەگرم
لەگەڵ وێنـەکەی (کاوانی)
کە بۆ کورد بوو بە قوربانی
لەگەڵ هـــەزار و یەك وێنە
کە هەمووی خەڵتانی خوێنە
هی ئەوانەی بۆ کورردستان
ئازایانە بـوون بـــە قــوربان
ئەیانخەمە ناو شووشـەی دڵ
بۆیان ئەڵێم شیعری بە کوڵ
* * *
گیڤارا هـەتا هـــەتایە
یادت رووناکی دنیایە

گوێم لە شریخەی لێدانی دارە
قامچی لە پشتی داغان بێزارە
کە من دڵسۆز بم بۆ سزادراو
چۆن بم بە قامچی بۆ ئەو زۆردارە

ئەی خالۆ گیان من رەنجبەرم
بۆیە ئێجگار کورد پەروەرم
با هەر گۆرانێکەی جاران
بڵێینەوە، بۆ کـــوردستان:
( ئەو کەسەی لە مردن ترسا)
( لە کاروانی خەبات جێ ما )

## تکەی ئاگر

شـــەویان تکانـــە ناو پێڵووم
تکەی ئاگریان سوو لە رووم
مانگی دەرونیان شکانم
ئەستێرەی دڵیان پروانم
لوتکەی چیا داماوەکان
گوندە رەشە سووتاوەکان
ئەسرینی کلّپـــە ئـــەرێژن
جریوەی ناســك ئـــەنێژن
بە نۆ خەنجەر دڵیان سمیم
لە ئاگر و خوێنا ئەژیـــم
(نۆ) ساوای هیوایان کوشتووم
ئارامی (نۆ) ساڵیان رشتـــووم
وا شیعرم داگیرسانەوە
ئاسنی سامـــم توانەوە
دوا قەڵای وەنەوزم رووخان
خوێنی ئۆقرە و ماتیـــم رژان

هاتوومـــەوە بەرەو مـــەڵبەن
بەرەو شاری دەروون بۆگەن
بنوو ئەی شاری خامۆشان
شاری نەفام و رەش پۆشان
دوور لـە ئەرخەوان، سووری سام
بنـــۆشـــە شـــەرابی ئـــارام
با گوڵانی یاد هەڵوەرن
دروشمـی زەبر داگـــرن
تەرمی خەمخواری بنێژن
خوێنی رابردوو بـــڕێژن
بنوون نوستنێکی بەتام
نوستنی گێلۆکەی نەفام
ئەوانەی مردن بۆ وەتەن
لـە خەویشا ناویان نەبەن
دڕ دەن ئەی کێوانی ژیان
ئەبێ شاخ بێنمـە گـــریان
ئەبێ هەزاران پێشێل کەم
تا ئەگـــەمەوە دڵەکـــەم

ئەو دڵەی وەك دڵان نی یە
ترسنـــۆك و نـــیان نـی یـە
بێ بـــەزەیی یـــە و ژان بـــەدەست
وەك خۆم جەربەزە و بێ دەربەست
وەك ئێـــوە نـــالـــەبار نی یـــە
کویلەی کۆشك و تەلار نی یە
دڵە گەشەکەی جارانە
( دڵی پاکی تێکۆشانە)

١٩٦٧

# شەونم

تــــاریکـــایی زینـــــدانی تـــەنگ،
ئـالآبـــوو لـــە گـــەردنی مـــن
ئەی کچی جوانی شۆخ و شەنگ،
با قژ بئالێ لە گەردن
دەمم ئەنایە ســەر برین
لە عەزرەت ژانی بەتینی
با هەڵمژم دەمی شیرین،
بکەم ماچـی ئاگــرینی

## سەرگوروشتەی والا

خونچەی وشەی بە نمی ئۆخەی پاراو
زەردەخەنەی گــەرمتر لە خــۆرەتاو
لەناو باخی لێوی دایکا ئەو ساتە
کە دوا بەندی چاوەنواڕی و ئاواتە
لەو کاتەدا جگەرگۆشەی دوورکەوتووی
دێتەوە لای دڵی بــــە چــــراوك بووی
ئەم خونچەیە، بە بای بەکام گەیشتن
ئەبێ بە گوڵ ورد ورد دێتە شنــەشن
لەم خونچەیە جوانتر نێرگزی کاڵە
کە بەتەنیا جێگــەی لێوی مــناڵە
نێرگزەکەی وشەی نـازداری دایـــە
لەسەر لێوی سەد هەزار وشەی تیایە
مەم لە زین بوو، بولبول لە گوڵاڵەی گەش
نابێ بــەوەی منالی دووربێ لـــە بـــاوەش
هەرچی گوڵە بێ بەری بن لە شەماڵ
بە ژان نی یە وەکو بێ دایکی منــاڵ
بە خۆری ناز، خونچەی گەشەی کۆرپەی کۆش
ئەبێ بە گوڵ لـــەســـەر چلی نەغمەی خـــۆش

* * *

وەك هۆزاری ترسا و لە سایەی پەرژین
کە ئەنوارێ بۆ ئاسۆ و ئاسمانی شین
وەیا کـــەوی مـــەلاسی نـــەپێکراو
وڕی زیخی جێ فیشەکی ناشی ی راو
بـــەو وێنەیـــە منالێکی بەسزمان
ئەینوارِییە بنمیچ و تەژەی سەربان
لە پشت چمکی کراسا، مەلاس و کز
ئەیترو کـان جوتێ چـاوی وەك نێرگز
تەپلە قووچی، سمێلْ زلی سەرسەنگ پڕ
لە والای ورد، پارچە ئالتوونی خرِخرِ
دەستی نایە ســـەر تـــەنگەی زلْ ســـەر پشتێن
هەردوو پێ ی جووت، دانی ریچ وەك تۆلەسێن
لە شەخەلی رووی گرژا، رەشەبای دەنگ
کە هەلی کرد وەك تەپلْ و کەرِەنای جەنگ
کچی ناسك، منـــالی خرپن و جـــوان
هاتەوە یەك لە ترسا وەك ژێ و کەوان
وەکـــو کـــەو چـوو خزایە پێچی داوێن
تەپلە قوچیش چاوی سووربوو وەکو خوێن
رووی کردە ژن وتی: ئەی ژنی رسوا ١
لەکوێت هێنا، لەکوێت بوو منالی وا؟

ژن رووی کردە مێردی پەروەردەی تاوان
وتی بۆچـــی؟ مـــناڵێکـــە بـــێ بـــاوان
زۆر عەزرەتیم بۆ ئـــەوەی بم بە دایك
تۆش دڵسۆزبە بۆ ئەم کچە وەك باوك
تەپلە بە سەر! پـــەلاماری دایـــە شێر
مناڵەکەش بۆی دەرچوو هەر وەکو تیر
باخە و باخ و بنچك بە بنچك گشتی
گەڕا تا دی وەکو نێچیرێ کـــوشتی
بە دەما کەوت، وەك کەوتنی کاتی ورك
خوێنی رژا بۆ ناو پـــەڵاش و تـــووترك
شێری سڕی نایـەوە ناو کێلانی
سەرنجی دا لـە ئەستێرە و نیشانی
نواریە دوور، لوتکـــە چیـــای کـــوردستان
هەردوو پێ ی جووت سنگی زیاتر دەرپەڕان
وتی: کورد بوو بۆیە کوشتم، چاکم کرد
ســـەر بـــەرزییە کوشتنی مناڵی کـــورد
سا تەپڵە قووچ بگرە گولـلە و ناو دەمت
من خوێن ئەکەم بە لاجانگ و پەرچەمت
بە یەك دەسرێژ زرم دام لـە بن چنگی
لـە ناوی دەم، لـە نیشانەی سەر سنگی

١٩٦٥

## عاشقبەن

بۆ ئەو سەرسنگە گۆشتنە
ئەو لاملو بەر گـــەردنە
کام وشەی زێڕین و جوانە
بۆ یارم کرد بە (گـەردانە)

* * *

لە وشەی وردی ڕەنگـاوڕەنگ
بۆ کەمەر نەخشی باڵای شەنگ
(( هەیاسەیەکی)) وام بۆ کـــرد
پڕ بوو لە نەخشی جوان و ورد

* * *

لەو هۆنراوانەی زۆر وردن
بۆم داڕشت (ملوانکەو بازن)
بۆ (گۆ و بەرۆك، دوگمەو دۆلاب)
ریزم کــرد وشـــەی زۆر نایــاب

* * *

بۆ وەسفی رووی: کام وشە بوو
جوان و بــەتام، تیا بێ تــەزوو
سەرجەم هەمووم بەکار هێنان
لە رستی شیعرا، دێڕی جوان
لە نێرگز و گوڵاڵەی گــەش
لە شەوبۆ و لە رێحانەی رەش
لە ((زەردەپەڕ و لە گزنگ))
((ئاوی تاڤگە و نمی ئاورنگ))
وەسفی زۆر جوانم بۆ مژی
بۆ بەژن و روومەت و قژی
وە مزانی وشەی جوان تەواو
لە کــەژا، ئاوا، خۆرەتــاو
لە ئاسمـــانـــا، دەشتا، تەما
وشەی جوان و شیرین نەما

کەچی کــە نوارِیمە چاوی
بەرگەردنی رەنگ هەتاوی
دەریـایـــەکــم دی فــراوان
پڕ لـە بریسکەی گەش و جوان
وشەی وەك مرواری و یاقووت
لــە بنـیا ورد ورد ئــەبزووت
لە وشــەی تازەی پەڕ لـە فــەن
بۆم دروست کرد یەك (عاشقبەن)
بە یەك ئەڵقە، دڵی من
پێوەی بەندە هەتا مردن

# ژیلەمۆ

کام ئاواز خۆشە یا کـام گۆرانی
بە هەر جۆرێك بێ پاراوی خەمە
کام بەستە جوانە، بۆ کامـەرانی
هێشتا شێوەکەی هەر هی ماتەمە
* * *

ســـروودەکانم پڕن لە سۆزی
گریان و ناڵە و ئازار چەشتنێ
شیعرەکانیشم هەر بـە ئاڵۆزی
تەنیا ریز ئەبن بۆ خـەم رشتنێ
* * *

زرەی کۆت لە ناو دەروون و گیان
زۆر جار مەچەکی ئارام ئـــەبەستێ
هۆنراوەی جـوانم لــــە بێ دانانا
لە تاو خەم جار جار لەپڕ ئەوەستێ
* * *

زۆر وشەی جوان و گەشی وەك ئاگر
لـــە دڵی منـا بـــوون بە ژیلـــەمۆ
زۆر شیعری گەرم و شیرین و نـــەمر
بـــە دیل گیراوون وەکـــو مـــن و تۆ

## له پێناوی چاوەکانیا

دوا تەزووی سەرما قاچی گەست
دوژمن هەردوو مەچەکی بەست
ئاوورِی دایەوە... چیا
شەپۆل ئەدا، وەکو دەریا
کولّم و چاوی گەش ئەباری
بۆ ناو خاکی کوردەواری
جیّ ی هیّشتبوو چیاو نزار
گەرِابۆوە بۆ لای نازدار
بۆ سلیّمانی ئاگرین
بۆ لای کچۆلّەی نازەنین
بەلاّم چاوی جوان و گەردن
بوو بوون بە خۆراکی مردن
پەنجەی نەگەیشت بە گولّی
رووی گەشی نازداری دلّی
ئەلّقەی پەتی بۆ گریّ دەن
درەنگە خیّرا هەلّی خەن
لە پیّناوی چاوەکانیا
ئەو بە سزمانە ئەژییا
لە پیّناوی ئەوانا مرد
لاشەکەی بوو بە خۆلّی ورد

# گریان

چاوت کە فرمێسکی تێ زا
تیشکی رووت تیـا شکایەوە
وەکـــو گــــوڵێ لە پایزا
ئارامـــم تـیایـــا تـوایـــەوە
*　*　*

وەك دڵـۆپی بـــارانی خـــەم
بۆ ناو دەریای چاوت تکـــام
نزیك برژانگ ئەی چاوەکەم
لـە ناو شـــەپـــۆلا ئـــەگریام
*　*　*

پشکۆی ئاگر، شووشەی شکاو
هەستی منیان گـرتـــە بـــاوەش
تا ئەو شوێنەی بڕ ئـــەکـــا چاو
دوای تاوێك رەنگ کرا بە رەش
*　*　*

نەختێکی مـابـوو بخنکێنـم
بەڵام کەشتی زەردەخـەنـە
کەوتە فریام و گەیشت پێم
هاتم تا ئەو بـەر گـەردنە
ماچـم کـرد لا ملت ئازیز
وتت ناگریم هاوڕێ ی ژیان
وتم من نەمـدیوە هـەرگیز
کـارم واتێ بـکا گـریـان

# چرۆی شیعر

لە پەڵە هەوری، تـەڕی، بزێوا
لـە، هاژەی ئاوی چەم و نشێوا
لـە خرمەخرمی (شـەستە بارانا)
لـە، دوا هەنسکی قوڵپی گریانا
ئاوازەی گەرمی شیـعرم بیستووە
زۆر جار، لـە تاوا، لێوم گەستووە
تا دێڕێ شیعری جوانم ڕست ئەکرد
ئارام لـە دڵما، وەك سـاوا ئـەمرد
ئەگەڕام خەمـگین بۆ چرۆی شیعرێ
بە، وەیشوومەی ژین زوو هەڵ ئەوەرێ
کەواتە، ئێستە، کە، دڵم شـادە
گیانم لـە کۆتی جەخار ئـازادە
گوڵە سوورەکەم گەش و پاراوە
کەلـەپچەی دەستی هەوڵم پساوە

ئەبێ شیعرەکـــەم تەڕ و بڕتر بێ
گەرم، وەك گڕی گەشی ئاگربێ
لە جاران گەلێ خۆشتر بێ نەغمەی
لە تام چـــەشتنیا هـەر بڵێم ئۆخەی
بنـــووســـــە، دێڕی پڕ تام و لـــەزەت
دووربێ، لە گریان، هەنسك و خەفەت
شیعرێ بێ دەنگی پڕ لە ئاوازە
بتـوانم بڵێم شیعرێکـــە تـــازە
ڕەنگی وەك ئاسۆی ژینی ئێستا بێ
ڕەونـــەق و گـــەشی ژیانی تیا بێ

# کامیل

ئەی باڵندەی شیعری خەمگین
با، پێکەوە بیکەین بە شین
گریانێك بگرین گەرم و گوڕ
ئەسرین بڕێژین لێڵ و خوڕ
وەرە ناو هێلانەی دڵم
گوێ بگرە لە گریەی کوڵم
بزانە چۆن فرمێسکی لێڵ
ئەڕژێتە سەر رووم گەرم و وێڵ
دەخیلت بم پێنووسەکەم
تێر بۆم بنووسە بۆ ماتەم
بنووسە: لە هەڵبەستی ورد
بۆ ئەو یادەی دڵی سست کرد
بۆ، ئەوانەی جەرگیان بڕین
دێڕی شینیان بۆ، ئەنووسین
ئەی باڵندەی ئاوازی هەست
با بگری دڵی مات و پەست
خوێنی جێ پەنجەی لە خۆ دان
فرمێسکی چاوی پڕ لە ژان

دڵۆپ، دڵۆپ، لەسەر، رووی ژین
ئـــەنـــووسن شیـــعر و دێـڕی شین
کە، بای خەزان گوڵی وەران
خونچە دەست ئەکا بە گریان
ئەی، کە، خونچەی ناسك وەری!؟
خەڵکینــە تـــوخـــوا کێ بگـری!
ئەبێ دار و بەرد و دەوەن
شەخەڵ و رووبار، مەڵبەن
ئەبێ چڵ و ووشکە گەڵاش
تـــوترِك و بنچك و پەڵاش
ئـــەبێ پـــایزیش و هــــۆزار
بگرین بە سۆز، بە کوڵ، بە زار
بۆ کۆچ کـــامیلی ئازیز
ئەگرین گوڵاڵەش و پایز
لە سیروان جـــلی رەنگاوڕەنگ
ئـــەگـــەڕێ بۆ کامیلی شەنگ
پـــارچـــەی کـــراسە، سپیەکەی
لەگەڵ دوگمە و چمك و یەخەی
ئەگەڕێن بن دارە و بن دار
بۆ کـــامیلی شۆخی نازدار

نـــــازانــــن لــــه ژێر خــــانا بوو
مرد، و... گڕ، لـه دڵمان بەربوو
له تاریکی ( ژێر خــــانێکا)
ئاو وەك گوللـه، دڵی پێکا
کامیل گیان دایکیشت نەما
ئێسته به کوڵ لـه خۆی بدا
بەڵام شارەکەمان به گشت
بۆ کۆچی تۆ فرمێسکیان رشت
شێوان بوو، کاتێکی نـــاوەخت
پێش هێرشی رەهێڵەی سەخت
کراس و کـەل و پـــەل و جل
هەمووی دانابوو، کاك کامیل
برِوا بۆ خوێندنێکی بەرز
لـەپڕ ئاسمان که هاته لـەرز
دڵی گەنجی نایـه ژێر خـــۆڵ
لـەگەڵ لاشەی دایکی کلۆڵ
لافاو، که، گەیشته هەیوان
دوو گیانی پێکـــەوه فـــڕان
کــــامیلی ئاخنی یه ژوور
دایکیشی رامالّی بۆ دوور

وەکـــو پەنا بەرێ بۆ شار
کامیل گیانی بکەن رزگار
یادی کامیلی لاوی ژیر
زۆر لاوم دێنێتـــەوە بیر
شـــــەوێکی هێنامـــەوە یاد
کە چۆن کوڕێکی دڵ ئازاد
لاوێکی ئازای شۆخ و شەنگ
نیشتمان پەروەرێکی مـــــەنگ
پەرچەمە زەردەکەی بـــــەخـــوێن
سوور کردو، بەردی کرد، بە نوێن
نەخشێکی ئاڵی کرد لـــەڕووی
نووسیبوی، ئەی لاو نەمردووی
وەك قـــــارەمـــانێکی نـــەمـر
لە پارچەی دڵ، قەمە و ئاگر
دارەمەیتێکیان بۆ، نەخشان
بوو بە میوانی شـەهیـــــدان
کامیل یادی ئـــەوی هـــــانی
بە پەردەی گوێمان چرپانی
کە، چاوم لێك نا بەبێ دەنگ
کـــاروانـی شـــەهیدانی شەنگ

هـــاتن بە ووردی تێپەڕ بوون
گڕ بەر بوو لـە بێخی دەروون
ئەی (فائزە)ی پـــەرچەم زێڕین
(سۆزان)! ئەی فریشتەی شیرین
یادی ئێوە لـەگەڵ سەرکۆ
لـە دڵمانا بوو بـــە پشکۆ
چۆن؟ بوون بە گوڵی ئەرخەوان!؟
بە خونچەی گـــوڵاڵەی سەیوان!
بۆچی دەمی بچکۆلـە و سوور
پـەنجەی ناسکی وەك بلـــوور
بێن بە تۆوی پەرشی دڵ
بێن بە نێرگز و بە گوڵ!!
کاروانی مەرگ بەرەو نەمان
کەوتە ڕێ، پیر و کچی جوان
کامیلی سەرقافڵەچی مەرگ
گڕی بەردا لـە دڵ و جەرگ
ئەم بـەهارە، گـــــوڵاڵەی هـــەرد
هەر دەم ئەبێ و کوڵمی بێ گەرد
ئینجا، کـــەی! لــــە، لای ئێمە گوڵ
هەر، ڕوومەت نەبووە و پەڕەی دڵ؟!

کامیل ئەی خۆشەویستی لاو
لە ورشەی زەردی خۆرەتاو
لـــە دڵۆپی شــــەونـمی ورد
لە پەڵەی گوڵاڵەی سەرگرد
لە بریسکەی خونچەی ناسك
ســامــاڵ وەك دەسماڵی تەنك
لە ئەستێرەی بە ورشە و شین
لە بەهــــاری تــەڕ و رەنگین
لە گشت جوانییەك وەرئەگرم
ئکلیـلێکتـــان بــۆ ئـــەچنم
ئەیهێنم بــۆ ســـەیوانی خەم
لەوێ تێر، تێر شیوەن ئەکەم
گوێژەی خەمگینی گەردن کەش
هەوری، بۆر، ئــەگرێتە بــاوەش
وەك نەیــەڵێ بچن بۆ شار
بیکەن بە قریشکە و هاوار
دیسان کوڵم و چاو و برۆ
رادەن بـۆ چـــەمی تانجەرۆ
دڵی لاوی پــــڕ ئــارەزوو
وەکو خونچەی نەپشکوتوو

تورِ دەن بۆ ناو ئاوی بەسام
لەگەڵ تاسە و هیوا و مەرام
پیرەمەگرونی مات، دڵ تەنگ
ئـەنوارِێتە ئـاسـمانی مـەنگ
وەکو تۆڵەی کوردی بویَ
دڵی، دەروونی نـاسرەویَ
ئەنوارِێتە گــۆیژەی نــازدار
پاڵ پشتی شاری مات، خەمبار
وەکو، بڵێ، ئەی گۆیژەی جوان
بۆ، رێت دا بە تـەرزە و بـاران
هێرش بەرن بۆ شــاری کــورد
شیوەن تیژکەن بۆ گەورە و ورد
کامیل: وێنــەی شیرینی رووت
هی رووی گەشی تازە پشکووت
بە تیشکی گزنگی قەد پاڵ
بەورشەی گەلاوێژی کاڵ
کێشراوە لەبەر چاوی من
تاماوم هــەرگیز نابیَ وون
شەرت بیَ لە سەیوانی دەروون
گۆرِتان بۆ بکــەم لــە ئاڵتوون

گۆڕێك لە ناو قووڵی دڵما
لە ناو دەروونی بە کوڵما
گۆڕێك لە زێڕی خۆش ویستن
لـــــەبیرمـــــانن تـــاکو مـــردن
ئێوارە بوو ســــوپای کـــوشتن
کەوتە، قەڵاچۆی گیان کردن
ئاوازەی ئەو ڕۆژە تاڵــــە
گریان بوو، زریکە و ناڵە
لە خۆدان هی سنگی ناســــك
دەنگ دانەوەی گریە و هەنسك
نەغمـــەیەکی وایان لێدا
بەندی دڵ تاڵ تاڵ ئەپسا
زۆر عەروسی خنجیلانە
ئیستە کەلاوەی وێرانـە
ئەو شوێنانەی منالی ورد
بە پۆل یاریان تیا ئەکـــرد
ڕۆچوونەتە جـــەرگـــی زەمین
وەك گۆڕی بەر لێزمەی بەتین
چۆلەکەی سەر درەخت و بان
هی سەر گوێسە بـانە و هەیوان

یان لەسەر بانیژەی رووخاو
ئێستەش کاسن لە تاو لافاو
ئەوانیش خوێندنیان خەمە
نەغمەی وتنیان ماتــەمــە
*　　　*　　　*

ئەی کامیل: بە چاوی گەشت
بە گلێنەی جــوانــی رەشت
بە کچی خنکاوی شیرین
بەو دلآنەی بۆتان ئەگرین
سوێند ئەخۆم بە سەیوانی ئاڵ
زریــکەی دایك بــۆ مــناڵ
لە بیرمانن ئەی کاکە گیان
هەر فرمێسك ئەڕێژن بۆتان
ئەی یادی لافاوی خوێن ڕێژ
بووم بە شاعیری شیوەن بێژ

## شووشەی شکاو

دایە گیان شووشەکەم شکان
شووشە، جوانە بچکۆلەکە...
زرنگ، کە دام، بە زەویدا
دەنگی لێ هات وەك چۆلەکە
چەند جوان بوو، کاتێ ورد و خاش
پرژایە، نـــاو کـــەوش و کـــلاش
-: ئا.. لاچۆ، خۆت لادە کچێ
وریابە، با پێت، پیـــا نـــــەچێ
دەستت شکێ....
دەك رۆڵە دەستت هەڵوەرێ
خوا ئەم نازەت لێ وەرگرێ
ئا، ڕامـــەکە، چوختی نەفام
با نـــەختێ تالاوت بـــــەمـــێ
پەنجەت پڕکەم لە تەزووی ژان
-: دایە گیان بۆ؟
-: ئـــا تۆ مەڕۆ
-: دایە من، شووشەکەم شکان
بـــەڵام خـــۆ تۆ بەری بـــەیـــان

بە، نارِەوا..
لەسەر کراس، سوخمەو کەوا
نایلۆنی تازە داهاتوو
دڵی باوکی منت شکان
-: ئەی چۆختی، ئا، رامەکە... تۆ
-: دایە گیان بۆ؟
من هەر شوشەیەکم شکان
بەڵام تۆ دڵی بە سزمان

# پەیژەی سوور

لە نێرگزی زەردەخەنەی ناز پژێن
لە سەرنجی شەرم ڕێژی دڵ بزوێن
لــــە ڕێحــانەی باخی گۆنای ئاڵ و گــەش
لە مانگی روو، تریفەی سنگ، چاوی رەش
لە ئاوازی وتــوو وێژی کــچی شــەنگ
چپەی نیان، نیگای گەش و ڕەنگاوڕەنگ
لە شەپۆلی لەرەی بەژنی شل و مــل
لە نجەی نەرم، ناسکی کەمەری شل
لەم جوانیانە لەم تاسە و دیمەنانە
لە ئارام و لە کامی ئــەم ژیانــە
لە گشت هیواو خۆشی یەك (بێ بەری بوون)
گیانێکی نوێ ی کردە بەری هەست و بوون
زەردەخـــەنـــەی مـــناڵەکانی پروان
گوڵی کامی دەروونی خۆی هەڵوەران
بەسەر پلەی پەیژەی سوورا هەڵزنا
کەوتە دووان لەگــەڵ گڕ و ئاسنا
وای لە خۆی کرد کە هەست نەکا ئاواتی
هـــەبــێ زیــاتــر لــە رزگــاری وولاتی

لە خۆی گەیان کە گیانێکە و هیچی تر
بەهێزترە لە ئاسن و لە ئاگر
بەم شێوەیە، کوڕی ئازای شۆخ و شەنگ
چنگی گیرکرد لە گەردنی شەوەزەنگ
شەهیدی کورد، بوو بە هەور لە ئاسمان
خوێنی گەشی بەسەر خاکا ئەباران
چاوی دایکی هەمیشە کاسەی ئەسرین
کەس و کاری و سەنگەر و کەژ بۆی ئەگرین
کەچی ئێوە، کە (هەر دەمن) بە تەنیا
شەرمێ ناکەن لە پەڵەی خوێنی چیا
سەنگەرەکان ئەگرین بۆ قارەمانان
ئەوان گیان، بۆ پارە نەبوو، بەخشییان
ناویان نەما، گوڵی ناوتان وەرانن
پەڕەی یادی ئاگرینتان سوتانن
مەگەر هەر من ناوی شەهیدانی کورد
جار جار بێنم بە سۆزی هۆنراوەی ورد

٧١

# گڕ

کە پرچت ئاڵان لە گەردن
گڕت بەردا لـــە دڵی مـن

کە پەرچەمت رشتەسەر روو
ئاگر لـــە دەروونم بـــەر بوو

ئەی زۆرداری جوانی بچووك
تکایە کـــچی ئێسك ســـووك

لێرەوە مەیە شەیدام بۆت
وە باڵی دڵم بە ئەستۆت

## تەزووی ئاوازە

لە ناو بــاخـــی دڵی منا تـەنـیا خــەزانە
گوڵ ناپشکوێ، بولبول زەبوون گەڵا ڕێزانە
هەور ئەگری، ئاسۆ رەش پۆش، ئاسمان خەمگینە
بۆ هەر لایەك گوێ هەڵ ئەخـــەم زایەڵە و شینە
ڕۆژێ نەبوو لە خواستی خۆش تاسەم شکابێ
لە نــاو باخی کامیاریما چـاو تــروکــابێ
یـا پــانــایی ئــاسمانی دڵ یـەکسەر سامان بێ
دەشت پاراو و فەرشی بەهار گوڵاڵەی ئاڵ بێ
هەر پایزە و هەورە گرمە و شــریخــە و ناڵە
( گەڵا وەرین، شینی بولبول مەرگی گوڵاڵە)
جەرگی نەغمەی مۆسیقای خۆش، تەزووی ئاوازە
سنگی کــۆرپــەی وشەی ناسك، هۆنراوەی تازە
دران بەسەر دڕکی خــەمــا، بــەردی مــیندتی
تام نەچەشتووی قومێ شادیم، دەروون عەزرەتی
تەمەنێکم من بەسەر برد هەمـووی مــەترسی
تاوێ بەند و، دەمێ بێ ئیش، سەردەمێ برسی
ڕۆژێ نەبوو تەسەلام بێ، لە پشوو. ئارام
تەمەنێکم پێچایەوە، پڕی بوو لــە سـام
یا لە (نوگرە) عەزرەتێ بووم بۆ قۆمێ بدفراو
من و بـەرد و هاوڕێکانم، جگــەر هەڵقرچاو

هەر سەبوون بوو، قرچەی گەرما، هەر بیابان بوو
نە چڵی تەڕ، نە گوڵی گەش، نە چیای جوان بوو
یا سەردەمێ ئاوارە و وێڵ، جێم چۆڵی و هەرد بوو
دۆشەك زەوی، لێفەم ئاسمان، ســـەرینــم بەرد بوو
ئێستەش تلْپەی تفتی خەفەت، دوا قوم ئەنۆشم
هەر بە رەشی و تاریکایی ژیـــان ســەرخۆشــم
هاوڕێکانم وەك من شەیدای خاکی وڵات نین
سووتەمەنی کلْپە و گڕی ڕێگەی خەبات نین
هاوڕێکانم هەر ( بە دەم هەن)...، شەیدای سامانن
( دەمی درۆن)، زەبری دەست و بازووی تـــاوانن

١٩٧٠

ئەڵێم خۆزگە لە جیاتی خوێن، دەمارم ئاوی تیا بوایە
لەناو جەرگەی بیابانا لە پڕ یـــارم پـــەیا بـــوایـــە
لەبـــەر تەڕکردنی لێوی، بە بێ پـــەروا لە بەردەمیا
بـــە نووکی خەنجەرێ خوێنی دڵی خۆم بۆ بڕشتایە
(لە ئینگلیزیەوە)

هەرچیم کردووە لێ ی پەشیمان نیم
هەر زوو ئەمزانی وا هـــەژار ئـــەبم
لەگـەڵ خـــەبـاتا من بێ پەیمان نیم
ئەمزانی تووشی ســـەد جەنجاڵ ئەبم
چونکە لە لای مـــن تـــەنیا قوربانی
بە ژین ئەبەخشێ رووناکی و جوانی

# کوشتنی عەبە

سام وا تەزووی رشتە هەناو
دڵی هـەموو دایکیێ لـەرزی
لەگەڵ دەرکـــەوتنی هەتاو
وشەی خۆش لـە دەما تەزی
زەردەخەنە لـــە ئـەســرینا
وەك گۆیەکی زێڕ تــوایەوە
خــەندە لە قوڵپی گــرینـا
خنکــاو یــەکسەر بڕایەوە
کۆڵانـەکــان کش و بـێ دەنگ
تەنیا هــەر شــریــخەی شەستیر
لێ ی ئەدا نەغمەی سووری جەنگ
خوێنی تێکــەڵ ئـەکرد بـــە شیر
ئەو کەســەی دەرچـــوایــە لە ماڵ
کــۆڵانــی بۆ ئـەبــوو بـــە گۆڕ
گــەنــج بــوایە، یا پیر، یــا مـناڵ
سنگی ئەیرشت خوێن، چۆڕاو چۆڕ

لەناکاو تیری زریکــە
دڵی هــەمــوومانی سمی
دوژمن بانگی کرد بیپێکە
دەنگێ وتی: ( ئاخ کوشتمی)
دوو سێ کارژۆلەی بە سزمان
لــەگــەڵ منالێکی شــوانا
لەناو گۆمی خوێنا گــەوزان
لــە پێچی تــەنگی کــۆلانا
منالێ هــاواری ئــەکــرد:
وەرنە دەرێ (عەبە)یان کوشت
توخوا فــریا کــەون وا مــرد
خــوێناوی سنگی هەموو رشت
گــولاڵــەی دەروونــم وەران
درکی تۆڵەم نــایــە شــوێنی
بــەڵێن بێ ئــەی زەبری ژیان
هــەرگیز من ون نەکەم خوێنی
لێرە منالی کــوردستان
بەم شێوەیە لەناو ئەبەن
ئەرێ دایکانی هەموو جیهان
گوێ بگرن.. هاوارێ بکەن

## مسی مەنوونە

وەك گوێم مسی مەنوونەی تێ کرابێ
وەك دەروازەی هـــەستم خڕ داخرابێ
نە هاوار و نەلاڵانـــەوە و گـریان
نە ئەگەین بە ناخی دڵ و بە گیان
وام ئەزانی تـــاســـەر ژین ئـەبێ وابێ
دوور لـە خەفەت هەر شادیم بۆ لوابێ
وام ئەزانی ئەبێ هەر بۆ خۆم بژیم
بەبێ ئەوەی بزانم مـن کێم و چیم
با هەزاران رسواو بێ دەرەتان بن
با مناڵان هەژار و سەرگەردان بن
مـــن کە دنیام بە هــــەشتێکی بـــەرین بێ
چوار چێوەی دڵ چەپکە گوڵی رەنگین بێ
با هەمیشە هەر بە خۆشی خۆم مەست بم
بۆ بـە خەمی ئەم و ئەو من دەربـەست بم
بەڵام پاچ و پێ مەڕەی کورد پەرستیم
کـــەوتە وێزەی ژیانی بێ دەربـــەستیم
هەنگاوم نا لـەسەر رێگەی رەنج کێشان
بەرەو لـــوتکـــەی تـــرسناکی تێکۆشان

بەلاّم ئەی داخ منی جاران بیَ دەربـــەست
ئیَستە کە بووم بە مەشخەلّی بیر و هەست
منی ئیَستە بیَ پەروا لـــە قـــوربانی
لەگەلّ هەزار برای گیانی بە گیانی
وەك بــە تەنیا هەنگاو بنیَم وەهـــایە
کەس لەگەلّما بەرەو رووناکی نایە
ئەو کەسانەی هاو ریَگەمن وەك من نین
چاو چنۆکن هـــەر بۆ گیرفـانیان ئەژین
هەش بەسەر و زەبوون ئەو هەژارانەن
کە چاوەڕیَ ی رەنجی درۆی ئەمـانەن

١٩٦٩

## تاڵی گڕ

پشکۆم کرد بە ئەڵقە و بازن
گەردانەی ئاگر بۆ گـــەردن
لە تاڵی گڕ چنیم لە چك
بۆ قژ و ڕوومـــەتی ناسك
کراسی نەرمی ئاگر چن
ئاودامان ئاڵا لە بـــەژن
نێڵە نێڵی ئاگـــری خـــۆش
بوو بە نەغمەیەکی بە جۆش
دوو کەڵ لەسەر سنگ و مەمك
بـــوو بـــە دەسماڵێکی تـــەنـــك
ووتم: بۆ دیدەنیت تینـــووم
ئەی پەری وەرە ناو پێڵووم
دایمێ چەپکێ ئاگری ڕووت
پشکۆی لێوی هیچ نەبزووت
دوا گـــۆرانـــــی ئارامم کـــوشت
خوێنی دوا بەستەی گەرمم ڕشت
قیژانم نـــامـــــەوێ ئاگـــر
مەبارێ ئەی کلۆوی بەفر
بەژنی شەنگەکەم بەرینە
بەرگی جوانی ئـــاگرینە

١٩٦٣

# دیمەنێك

دێ:

کەژ و دارستـــانی کێی
پۆشیبوویان بەرگی سپی
قوبەی پیرۆزەیی سامالّ
بە پرشنگی گزنگی ئـالّ
داوێنی کەژی ئەنـــەخشان
وەك ئەگریجە ئەبوو پەخشان
دێیەك لـە باوەشی کەژا
بزەی گەرمی لیّ ئـەڕژا
*　　*　　*

دوژمن:

کاتیّ کە خۆر رمیّ سەرکەوت
لـەناکاو کۆمـەڵیّ دەرکـــەوت
کۆمەڵێك دوژمنی چەکدار
کشان بەرەو گوندی نازدار
ئەم (میوانانـە) وەکـــو تـــەم
دایان گرت دڵی دیّ سەرجەم
سام وەکو رەهێڵەی چقڵ
باری بۆ سـەر دەشتایی دڵ

دوژمنی رسواو بێ دەرفـەت
دایان ماڵی هەگبەی خەفەت
دوای پشوودان و نان خواردن
لـە پاش نــان و نمــەك كــردن
پەنجەی مردنیان درێژکرد
بۆ لاوێکی هەژاری کورد
دڵی ئاوایی داتەکی
پەلاماری دایە چەکی
بوو بە قرم و هووڕی گــولـلـە
لـە دوژمن کوژرا، وەك کولـلـە
دوای شەڕێکی گەرم و بە سام
دوژمنــانی ئــۆقـرە و ئــارام
دوو سێ منالّیان گرت خرپن
کە جێ مابوون لـە راکردن
کردیانن بە دیـاری مــردن
وتیان: (وا ئەبێ سەرکەوتن)

# کانی بەهرە

با بسوتێین، بۆ وشەی جوان، بیری جوان
هۆنراوەی جوان، ڕستی بە زەبر و رەوان
هۆنراوەی جوان لـە گولاڵـە جوانترە
لە کـــەژاوو لــــە رووبار رەوانترە
لە لوتکەی کێو بەرز و گەردن کەش ترە
لـــە بـلێسـەی گڕی ئاگر گــەش تـــرە

*

هۆنراوەی زەرد، بە خەمی دڵ ئاودراو
زەردی کـاڵی وەك برژانگی خۆرە تاو
سپی ناسك، بـــووکی دەروونی خـــاوێن
سووری گەشی وەکو پەڕەی گوڵی خوێن
هەموو جوانن، هەموو گەشن، پاراون
هـەموو گوڵن لــەنــــاو دڵا رووراون
با هەزار و یەك هۆنراوەی رەنگاوڕەنگ
وەکو کچی گۆشی ناز و شۆخ و شەنگ

لــەرِێ ی کــانیی دلآ بێنـــە لەنجەولار
بەرە و لووتکەی چیای هۆنراوەی نازدار
لەسەر دوگمەی پیانۆی دەروون، ئاوازە
پـــەخشـــان بکـەن بۆ ژینی ویژەی تـازە
هەموویان جوانن بەلآم ئەوەی نەمرە
تەنیا شیعری پەروەردەی نـــاو ئاگرە
شیعری کسپەی جەرگی بێ دەرەتانە
گوڵی پشکۆی خـــەباتی کوردستانە
هەڵبەستێکە وەك دەمی برین ئاڵە
هۆنـــەرەوەی نـاسۆری ژینی تاڵە
پرِ هەنسك و تاسە و قوڵپی گریانە
بۆ هـەڵمەت و بۆ ورە و تێکۆشانە
رەگی لەگەڵ ریشەی دڵ تێك ئالآوە
بە دڵۆپی خوێن و ئارەق نـــوســــراوە
ئەی هۆنراوە ئــەی لــــە مـــردن بەهێزتر
ئەی گۆشی خوێن پەروەردەی کۆشی ئاگر
تۆ بە خەنجەر، دەس و پەنجەی خوێناوی
لەسەر دڵ و جـەرگی مێژوو نوسراوی

وشـەی ناسك، ڕستی شیرین و بـــەتـــام
شیعری رووناك، وەك مانگەشەوی هیوام
ورشەی كانی بەهرەی هۆنراوەی شیرین
نـەخشی باڵی پەپوولـەی شیعری نەرمین
لـەرەی نەغمەی مۆسیقای سەلیقەڕێژ
یـــا زاراوەی پـــاك و وردی والآ بێژ
هۆنراوەی جوان بەندی سەركۆزە و گێراو
دێڕی وەكـــو قژی وەكـــــو تـاڤگەی ئاو
بـەستەی تەڕی دەنگی ناسك و بـــەسۆز
چامەی ڕەنگین وەكو سەرسنگی نەورۆز
سەد ئەستێرەی كاروان كوژەی هۆنراوە
وشـــــەی روون و ڕەوانی وەكو چـــاوە
كامی جوانە خۆی و بیر و ئـــاوازی
بۆ هۆنراوەی ئاگر ئەیكەم بە جیازی
لای من ئـەبێ هۆنراوە بۆ هـــەژار بێ
دەنگی پاڵەو رەنجبەران و جووتیار بێ

ئەبێ قاڵ بووی بۆتەی رەنج و خەبات بێ
ئــەبێ خۆری کـەلی بــەرزی ئاوات بێ
ئــەبێ بـزە و گریانی لێ قەومابێ
زەبری تۆڵـەی قارەمانی کوژراوبێ
ئەبێ چنگ بێ و گیربێ لـە بینی دوژمن
ئەبێ چەك بێ بۆ کـاتی هەڵمەت بردن
ئەبێ خوێن بێ، ئەبێ نەبەرد و جەنگ بێ
نەك بە تەنیا هەر وشەی رەنگاوڕەنگ بێ

١٩٦٥

# دوگمەو قەیتان

لە جوولەی نەرمی باوەشی ســـوخمە
کە چنگ گیر ئەکا قەیتان لە دوگمە
لە نەرم و شلی ی کەمەر و لـەشی
تیشکی گولاڵەی روومەتی گـەشی
لە ناسکۆڵەیی کولم و گەردنی
چەپکێ هۆنراوەی رەنگینم چنی
کەچی ئەو کچە شۆخە ئازیزە
هەر لەسەر ئەوە دڵی لێم زیزە
ئەمەی من کردم لای ئەو تاوانــە
نابێ پێ ی بڵێم وەك پەری جوانە

# خەرمانەی سنگ

پەنجەی نەرمی برد بۆ دوگمە
ترازانی بـەنـدی سـوخمە
بەرگی ئاڵی پوولـەکـە چن
لەرزی وەك پەڕەی دڵی من
دەستی برد بە دووسیَ تەکان
دەری هێنا مـانگی ژیـان...
گۆی مەمك رووی کردە روومەت
رشتی عـەتر و تـەزووی لەزەت
تەلاری خـامۆش و بیَ دەنگ
تیَ ی رژا هەزارو یەك رەنگ
ئاوێنەی رەنگ مەیلە و گزنگ
روون بۆوە بە خەرمانەی سنگ
کاتیَ خۆی گوشی مەمکی رووت
تەزوو لە دەمـاریـا بـزووت
لە سنگی گەرم و ناسکا
قەترەی ئارامی خۆی تکا
سست بوو بەژنی نەرمی خۆشی
تـا زوو بـە قـژی داپۆشی
( ژین هەرچی تیا هەیە جوانی
نـاگـا بـە سنـگـی نیانی )

١٩٦٣

# ئەم ئادەمزادانە

تازە خۆری بـــەیانی هـــەڵ ئەزنا
بۆئەم دیو کەژ بە ناو دار و دەوەنا
تازە تەزووی ماندویێتی ئەرکی دوێنێ
لە ئەژنۆوە ئەخزا بەرەو پـەنجەی پێ
تازە درکی رەنجی دوێنێ ی بێ وچان
هەڵ ئەوەری لە دەماری بازوو شان
کـە داسەکەی هەڵ گرت و نانە بـــەرە
ورد ورد کشا بەرەو ئەو دەشت و دەرە

*

لەسەر سنگی لـەت و پەتی خەرمانان
زامی پەنجـــە دیسانەوە هـــاتـــە ژان
رەنجی سەختی بە تەنیا هەر بۆ نانە
بۆ منالّی رووتەڵە و بـــە سزمانە

* * *

کاتیٚ زەردە توایەوە ناو ئەو دیو شاخ
تاریك داهات دارستان و چەم و باخ
گەڕایەوە بۆ بەردەمی دیواخـان
تا بزانیٚ چی هەیە. کار و فرمان
کوڕی ئاغا پیٚ ی وت: بۆچی وەستاوی
لە جیٚ ی خۆتا وشك ئەڵیٚ ی رووای
راکە خێرا مەسینە و لــەگــەن بێنە
تەمەڵ مەبە- چالاکی خۆت بنوێنە
ئەم نزمیە تاکــەی سەپانی هــەژار
گەمژە نەبی ئاوا نەکەی بۆ زۆردار
دوای ئەرکی رۆژ بۆچی دیٚ ی هەڵ ئەوەستی
دیســان کــەمــەر بۆ کاری تر ئــەبــەستی
هــەر بۆ نەختی نان و چێشتی بەرماوە
دەستی سووکیت لەسەر کەمەرت ناوە؟
ورتــە بکــا: یەکێکی وەك من بــە دار
خپی ئەکەی لەسەر خاوەن زەوی و زار

١٩٦٥

## هۆنراوەم ناوێ

هۆنراوەکانی تۆ جوانن
نێرگزی بەهاری گیانن
چیاوی دەروونی تینوون
رەزی ئاوات و ئارەزوون
تکەی ئەستێرەی گوشراون
ئەگریجەی زەردی هەتاون
هۆنراوەکـــانی تۆ گـــەشن
کۆرپەی ناسکۆڵەی باوەشن
بەرزن وەکو لوتکەی چیان
رەنگینن گوڵ و سەوزە گیان
بەڵام ئەی رووناکی هەستم
مـن لـە هۆنراوە وەڕستـــم
مەگەڕێ بۆ هۆنراوەی ورد
بۆ وشەی شیرینی دڵ کرد
هـــۆنـــراوەم نـــاوێ تۆم ئەوێ
پێم وتی: ( من تۆم خۆش ئەوێ )
ئەو دەمەی ئەو شیعرەی هەڵ رشت
نەك شیعر.... خۆی بوو منی کوشت

# شەو

مانگ کە پێڵووی هەوری لێك نا من دەمم برد
بۆ ئەستێرەی دەم و لێوێکــی وەك یــاقــووت
کاتێ کــە هــەوری ئەگریجەی خاویم لابــرد
تریفەی مــانگ ڕژایــەوە ســەر سنگی ڕووت
چرۆ و ئەستێرەکان و مانگ، نێرگز و گوڵ
خونچەی وردی ئاڵ و ناسکی لق و چــڵ
کە زانیان لەوان شیرینترە ڕووی سنگ
هەموو یەکسەر پەنایان بردە بەر گزنگ
مناڵانی ناو شــەپۆلی دەریــای هــەتاو
ڕێیان تەنیم بە دەزوولەی سەرنجی چاو
مەگەر دیسان لە پشت پەردەی شەوا بێ دەم
بنێمەوە سەر مانگی ڕوو، هەوری پەرچەم

١٩٦٨

## چلێك ئەرخەوان

وەك هەنگ ناوی دەمیم مژی
وتم: (ئــاخ تـۆ بلێ ی بژی)
کۆرپەکــەم پـیایا هــەلزنـا
پیّ ی وت: (بابە لەگەڵ منا)
وەرە بۆ نـاو رەزی چـیا
گریا و دڵی منیش گریا
وتی: بابــە ئـەچی بۆ راو
وتی: نەءبۆ چەمی خوێناو
چلێکم دایە ئـەرخــەوان
وتم: بۆ یاد هاوڕێ ی ژیان

*         *         *

شەوبوو لـە پەنا بەردێکا
دوژمن پەڕەی دڵی پێکا
ئەستێرەی وشــەی کــوردستان
هەڵهات لـە ئاسۆی لێوی جوان
ئەو کاتەی چاوی لێك ئەنا
لــە نـاو بــاوەشی مــردنا
لەگەڵ یادی منــا دووا
ئەرخەوانەکەی من رووا

# تەلار

مـــن ئـــاواتێکـــم هـــەبـــوو زوو
وەك خەوی خۆش لـە دەستم چوو
یارێکم هەبوو، وەك باڵدار
فڕی بۆ ناو کۆشك و تەلار
مەل بۆم گریا نەگریام خۆم
سەرم نەنایە سەر ئـــەژنۆم
ئەی گوڵی گەشاوەی بەهار
با تۆ ماچ کەم لـە جیاتی یار

# بۆ ئاگاداری

هۆنراوەکـــانم هـەر بۆ ئـــافـــرەت بوون
بۆ خونچەی گوڵ و بۆ جوانی ی سروشت
خوێنیان ئەمژی لـــە بـــەهـــرەی دەروون
رستی زێڕین و جـــوانیـــان دا ئـەرشـــت
هۆنراوەکانم لـــەنـــاو دەروونـــا
بۆ پەرەی گوڵی وەریو ئەگـریـــان
لـــە پـــایـــزێکی مـــات و زەبوونا
لەگەڵ وەیشوومەی زەردا، ئەژیان
ئەی چاو، ئەی کانی بەهرەی پێشووی من
ئـــەی روو، ئـــەی مـانگی شەوی جارانم
ئـەی ناز، ئـــەی لەرەی شـــیرینی بـــەژن
ئـەی زەردەخـــەنـــەی خـــەوی جـــارانم
ئەی گوڵ، ئەی چرۆ، ئەی لووتکەی چیا

ئـەی کـچی جاران گڕی ئـاواتـم
ئەی کانی روونی کۆشی سەوزەگیا
ئـــەی جـوانی کەژ و دەشتی وڵاتم
هـۆنـراوەکانم بوون بـە پـەروانـــە
لە دەوری چـــرای ئێـوە پـــەرستن
خۆشم بەم چەشنـە بـــووم بە دێوانە
بەڵام ئێوەی بت بەهـــرە نـــەویستن
گوڵ، گوڵی هەموو دەشت و چیایە
هـــەستی نـیـانـــی و ژاکـــان نـــازانێ
هـــەرچـــی نـــاسکـــی و ڕەنگێکی تیایە
ئەیبەخشێ بە گشت، نەك پەنجەی جوانێ
کـــچیش، دڵداری هـــەرچەند بەتین بێ
هێشتا هـەر شەیدای زێڕ و ســامـــانـــە
خۆشەویستێکـەی چـــەنـد ئـــاگرین بێ
ئـــەیگۆڕێتەوە بـــە یـــەك گـــــەردانـــە

کــوردســتانیشم، که من شاعیریم
لێم نەدی لـــەگـــەڵ مـنا نیان بیّ
من که فرمێسکی هۆنراوه ئەگریم
رۆژیّ نـــەمدیوه بۆم میهرەبان بیّ
بەڵێن بیّ ئەی کچ بەڵێن بیّ ئەی گوڵ
ئـەی دەشت و دەرو چیای کوردستان
مـن جارێکی تر. نـــەبـــەدەم نـــه دڵ
بۆ ئێوه نـەڵێم هۆنراوەی جوان جوان
تـــەنیا هـۆنراوه ئەڵێم بۆ هەژار
هەر لـەگەڵ ئێوەم ئەی هەژارینه
تـــەنیا هـــۆنراوه ئەڵێم بۆ هەژار
هەژار هەوێنی شیعری خـــوێنینه

١٩٧١

## مۆم

خۆزگە ئەمتوانی شیعری وام
ئەووت پڕی بوایـــە لە تـــام
شیعرێ بێ لــە عـەزرەتا خۆم
بتوێمەوە هــەروەکــو مــۆم
خۆزگە یەك هۆنراوەم ئەووت
وەکو خۆم بــوایە کت و مت
وەك دڵی خۆم وەك دەروونم
وەکو هـەستی پـاك و روونم
یان خۆزگـــە ئــەمـئەزانی من
یەك تۆسقاڵ شیعر رێك خستن
تا بم چەشتایــــە تــامی خۆش
لە هۆنراوەی گەرم و بەجۆش
ئاخ چەند لە دەمارم ئەخۆم
هۆنراوە، من سووتاوی تۆم
ناتوانم دەست هەڵگرم لێت
نــاشتــوانم برۆم بێ بــە پێت

# گوڵی وەریو

هاوڕێم حەسەن...

شێوەی جوانت، هیوا و تاسەت
سنگی گـــەرمی پڕ هەناسەت
چـــاوی گـــەشی ئـــەستێرەییت
ڕووی ڕووناکی ڕەنگ (پەمەییت)
تــاڵی قژی مـــەیـــلەو زەردت
زەردەخەنەی ڕووی بێ گەردت
بەژنی ڕێك و، ئێسکی سووکت
نەخشی ورد، دەمی بچـــووکت
(( هەر زوو لە دەرختی ژیان ))
(( وەرین، بۆ ناو قوڵپی گریان))
خەندەت ورشەی پارچەی ئاڵتوون
عومـرت وەکـــو مـــەل تێپەڕ بوون
ئەویـــان لەناو خاکا ڕۆچوو
ئـــەمـــیان بـــەژینا تێپەڕبوو

برام ئــەمــەویٚ هۆنراوە
بنووسم بۆت بەم خویٚناوە:-
بە خویٚناوی دڵ، خویٚنی چاو
خویٚنی سنگی بـرا کــوژراو
بە خویٚنی هاوڕێیەکی شەنگ
کە بوو بە نیشانــەی تفەنگ
بە خویٚنی (ئەختەر) و (بەکر)
بنووســم شیعــری وەك ئاگر
بەڵام کاغەزەکەم ســووتا
چونکە دڵ گڕی تیٚ بەردا
بۆیە هەرچەند ئەکەم شیعرم
ناتـوانم جــەمــســەری بگرم
هاورێم بە گەرمی و تامی نان
کــە بــرسی ئەکا، پەریٚشان
ئــەم بــرینە پــڕ لـە سویٚ یە
هی ئەم دڵەم کە تویٚ تویٚ یە

((نابیٚ)) !! هەرگیز نابیٚ سارێژ
تا نەبینم مەرگی خوێن رێژ
تۆش بە سویٚ ی ئەو برینەوە
بە دلٚێکی خەمگینەوە
جیٚت هیٚشتین ئاوارە و ناکام
نەتدی: ((کورد بگا بە مەرام))
لەم خاکی کوردستانەدا
لەم شوێنە فراوانەدا !!
ئەم شوێنەی هەمیشە سروشت
خوێنە ئارایشتی بە گشت
رێگەیان نەدایت لەگەڵمان
بژیت لەگەڵ بزە و گریان
دەریان کردی بۆ شوێنی دوور
جیٚت هیٚشت نیشتمانێکی سوور
مــردی، دوور لــە ولاٚتی خۆت
بۆیە (زۆر) بە کوڵ ئەگریم بۆت
با لەگەڵ هەورەکەی بــەهار
بگرین بۆ کۆچ، کۆچی نازدار

ئاخ تاسەی خۆش، ئاواتی دڵ
هەڵوەرێنە ناو جەرگی گـــڵ
چاوی وەك ((چاوە))ی پڕ جوانی
کە پڕی بـــوو لە پەنهانی
دڵ کە نەختێك بۆ دەریای ژین
کەیلی (هیوا)ی خۆش و شیرین
چوونە ژێر خاك ئەبن بە خۆڵ
شەماڵ گەردیان ئەبا بۆ دۆڵ
هاورێم حەسەن،
نـــەهاتیتەوە تـــا هـــەواڵ
بێنیتەوە بۆ دۆست، هەڤاڵ
هەواڵ: ((هی هاورێکانی من
کە ئاوارە و دەربەدەرن..))

نەمدیتەوە تا لاشەکـــەت
هاتەوە لە خاکی غوربەت
ئەی جوانەمەرگ، هاوڕێم حەسەن
مــردی خەمگین دوور لە وەتــەن
ئەی میوانی تازەی ســەیـــوان
ئەی ریزە کێل، ئەی ئەرخەوان
چۆن بتوانم بـــە ((دڵ)) بلێم
بە شەماڵ و بە ((گوڵ)) بلێم:
(( کۆچی کرد، هەرگیزاو هەرگیز
نــایـبـیـنینـــەوە رووی ئــازیــز))

# ئەو ژنە

گوڵی پاراو کاتێ کە دێتە شنـــە
جوانتر نی یە لـەو روومەتە خرپنە
گڕی کاڵی پشکۆی کەمێ گەشاوە
رەنگی جوانی ناگا بەو بەر گەردنـە
نەغمەی باخی شەوی بە شەونم شۆراو
بە سۆز نی یە وەك تریقەی ئەو ژنە
هەنگی چرپەی، لـەرەی بەژنی ناسکی
مۆسقای گیان، ئاواتی دڵی منە
هەر چەند ئەکەم وشەیەکم بۆ نایە
بیهاوومە بەردەمی ئەو شەرمنە

١٩٦١

# خۆرە تاو

ئەڵێ شیعرەکانی خۆشن
ئێجگار شیرین و بە جۆشن
وەکو پرشنگی خۆرەتاو
کە ئەدا لە شەپۆلی ئاو
ئاوا شیعری وەکو ئاڵتوون
لەناو دڵما، ناخی دەروون
ئەبن بە بریسکەی خۆشیم
لەگەڵ شیعری ئەودا ئەژیم
شیعرەکانی پڕ ئاوازن
کڵپەی دەروونی دڵخوازن
ئاهی گەرمی کچی شەنگن
وشەی خۆش و ڕەنگاوڕەنگن
بەڵام ئاخۆ خۆشی وابێ
تۆ بڵێ ی ڕووخۆشی تیابێ؟

گیانە هەڵبەستەکانی من
رازن بۆ جوانی پەرستن
بەڵام نازانم... بە تامن
رازاوەن، شیرین و جوانن
هەر ئەوەندە هەیە شیرین
هەستێکی پاکی ئاگرین
پێم ئەڵێ: وشەم لێ بگرە
تۆش پێ ی ئەڵێ ی پارچە شیعرە
خۆشم: ( وەك هۆنراوە، نازدار)
سۆزێکم بۆ دڵی دڵدار

# کچەکەی بەرتیلە[٢]

لامان دایە، (دێ) یەك بچووك
باخی رازاوە وەکو بووك
ماڵی ئاغا بە گەچ سپی
داوێنی گوڵی پەمەیی
بۆنی خۆش، ئاوازە و بەستە
کام دەنگ بزووێنەری هەستە
ئەیاندا لە پەردەی دڵم
زۆر خۆش بوو بەستەی: (ئای گوڵم)
لەرێگەی کانی کەڵەك بەرد
کیژی روومەت گوڵی بێ گەرد
ئەهاتە لەنجە، ورد، بۆ ماڵ
سنگ ئەیلەرانەوە دەسماڵ

---

[٢] لە ساڵی (١٩٤٧)دا، کە تازە پێم ئەنایە باخی گەنجێتیەوە چووم بۆ (ناو نوسین احصاء النفوس) وە لە دێیەك لە دێکانی کوردستان، ئەم رووداوەم دی... وە بەددستکاریەکی کەمەوە لەساڵی (١٩٥٧)دا کردم بەم هۆنراومیە:

لەگەڵ لەرینەوەی لە شا
هەڵهێنانی چاوی گەشا
پەپوولەی خۆشەویستی گیان
ئەفڕین بۆ شینایی ئاسمان
چوومە زنجێك تاریك و تەنگ
دانیشتم مەلوول و بێ دەنگ
دڵ تەنگ بووم بۆ کۆمەڵێ گیان
کە بەشیان خەفەتە، گریان
پیرێژنێك هات، گاڵۆك خوار
بەژنی وەکو کۆتەرە دار
نواڕیە رووم، بنمیچی رەش
دوا تیشکی زەردی خۆری گەش
وتی و دەمی پڕ پێکەنین:
ئەی، شارستانی، روو شیرین
نە پارەم هەیە، نە ماڵات
بە تۆی لاوی بکەم خەلات
گەر ناومان بنووسی یەکسەر
ئەتنێمە سەرچاو، تەپڵی سەر

ئەڵێن هاو، وڵات ژماردن
ئەکەن بۆ شەکر بەش کردن
توو بی لاویت ئەی کوڕی جوان
توو بی دڵی پڕلە ویژدان
بیّ بەریمان مەکەن برا
چاوەڕێین: بۆ شەکر و چا
لەدوای تاوێك ئەسرین رشتن
ئاخ هەڵکێشانی دڵی من
هاتن بە ریز، شەش کچی شەنگ
نیگاریان ورد و رەنگاوڕەنگ
مەمکی ژێر کراسی دڕاو
لە شەرما ئەلەرزی بە تاو
شیتاڵی جل، وەك هەوری زل
تیا دەرئەکەوت لا رانی شل
پیرێژن نواڕییە کچان
وتی ئەی کوڕ، ئەی هێزی گیان
هەڵگرە بەرتیل: (شۆخی دێ)
لەمانە کامیانت ئەوێ

که جێم هێشت، ئاوایی خەمگین
گوێم لێ بوو دەنگێکی شیرین
بەگریانەوە وەك ساوا
ئەڵێ: (ئەی شۆخەسوار) تو خوا
بەرتیلیش نەبم هەر بمبە
لەم ژیانە رزگارم کە
چیلکە چنینەوە و بژار
نانی گاڵ و زەبری زۆردار
جوانی رووم، بەژن، قژی خاو
ئەکوژن، با بێم ئەی کوڕی لاو
ئەوسام، ئێستەم بوایە بە راست
ئەو کچە نەشمیلەم ئەخواست

١٩٥٧

هەور بوومایە نمێ بارانم
دەغڵی زۆرداری نە ئەگرتەوە
ئاسمان بوومایە ئەستێرەکانم
ورشەی لە قەڵای زوڵمی نەئەدا
بەم باوەڕەوە ژینم بردەوە

بە لات بوونی من تۆ پارەداری
بە ژێر دەستی من خاوەن تەلاری

تا مناڵێ ببینم بێ نەوا بێ
هەڵ بزرکاو وەك گوڵی ژاکاو وابێ
تا ئافرەتی هەژار و بێ دەرەتان
هەڵ کرووزا و گەردن کەچ و رسوابێ
لەگەڵ خەندە هەمیشە دوژمن ئەبم
لەگەڵ خەفەت هەر دەست لەگەردن ئەبم

هەرچی درەختە گـڕی تێ بـــەردەن
پەپوولـەی هیــوای مـــن ناسووتێنێ
بای پایز هەمووی بە جارێ هەڵ کەن
ئەم خونچـــە وردەی مـــن ناوەرێنێ
چۆن ئەوە رۆژە ئەبینم هەڵات
ئاواش دڵ نیام ئەگەین بە ئاوات

توانەوەی سەهۆڵ، گەشانەوەی گوڵ
لـەرەی شێنــەیــی گـەڵاو پۆپی چڵ
بە تەنیا گەرمی و جۆش نادەن بە دڵ
کاتێ دڵی مـــن ئـــەگـــــەشێتەوە
کـــە بـــەفری خەمی کورد بتوێتەوە

کێ ئەمڕۆ دزە لای ئێمە پیاوە
کێش پیاوە، رەنجی بە با دراوە

## ماچی مردن

زامی دڵ بە پەنجەی ژیـان
هاتەوە سوێ وەکو جاران
ئەستێرەکان وەك شووشەی ورد
ڕژابـــوونـــە داوێنـی پـــرد
شەپۆل لـە باوەشی هەردا
سنگی ئەدا بەسەر بەردا
ڕەنگی خۆڵەمێشی ئاسمان
لـەسەر شانی سێدارەکـان
ئەینووسی: ((ڕۆڵەکانی کورد
ئاگرێکی وایـان خۆش کـــرد
بڵێسەی لـەگەڵ ژیانا
ئەمێنێ لـە کوردستانا ))

لەسەر پردی تەسکی بەردین
دەنگێك هاواری کرد: (کوردین)
ئەیزیزان: ئەی دوژمن یەك تاو
مۆڵەت بەن بە جگەر سووتاو
با بگەمە لای کوڕەکەم
بۆ دوا جار دەمی ماچ بکەم
کاتێ گەیشتە نزیك کوڕ
لاشەی بێ گیان بوو سارد و سڕ
رێ یان گرت لە ماچی مردن
هەر لەبەر ئەوەی کە کوردن

# سروودی سەرکەوتن[٣]

ئەی مەلی وردیلەی دەنگ خۆش
بۆم بلێ ئاوازێك بە جۆش
ئاوازێك بێ هی خوێن رشتن
نەغمەی ئازادی و سەرکەوتن
بەستەی گەرم وەکو هەتاو
هی هەڵپەڕکێ ی کوردی خوێناو
بەستەی گیان و دڵ، هی دەروون
شیعری ئەوانەی سەرکەوتوون
شیعرێ بێ ئاگراوی بێ
وەك چنگی گەل خوێناوی بێ
وەك قینی دڵ جۆشی تیابێ
یادی تاڵ و خۆشی تیابێ
باسی رۆژانی جاران بێ
هی تاریکایی زیندان بێ
ئەی باڵداری وردیلانە

[٣] هەر نەبوو شۆڕش بەرپابێت، بەڵام بە بیرمان نەئەهات، ئاوا کوتوپڕ و بەم شێوەیە، ئەموت شۆڕش نەبێت بەڵام خوێن نەبێ لاشە بەرێت ...

رۆژێك بوو، ئەم نیشتمانە
مەزاتخانەی لەش و گیان بوو
بازاڕی خەم و گریان بوو
هەر قژبوو، رەش، خورمایی، زەرد
لەسەر شان و ملی بێ گەرد
بە فرمێسکی ئاڵی خوێنین
ئەلکا بە گەردنا خەمگین
چاوەنواڕیی کچۆڵەی شەنگ
ئەڕژایە ناو زیندانی تەنگ
بەشمان، دارکاری بوو، لێدان
مووچەمان تف، جنێو پێدان
قامچی لەسەر پشتی زامدار
ئەیزیڕان با بمرێ زۆردار
لەبەر زیندانەکانا ژن
بەڕیز هەروەکو مێگەل بن
یا ساوڵێك و تف و دار
ئەیهێنانە گریە و هاوار
( بەزەیی لە چاوی دوشمن)
(تۆرا بوو وەکو ئێستەی من)

بۆ سەرداری پارە پەرست
بواریان نە ئەداین بە بست
لە روومەتی ناسکۆڵەی ئاڵ
لەبەر گەردنی زەردی کاڵ
لە دەم (لیرە)یان دروست کرد
خوێن و شادی و ئارامیان برد
بزەیان لە دەمی ساوا
ورشە لەناو قژی خاوا
خەندەی گەشی خۆشەویستی
زۆرشت کە دوژمنمان ویستی
ئەیان دزی ئەیان مران
خەویان لە پێڵو ئەتۆران
لانکەیان ئەنایە دەریای
خەفەتی ژیان و سزای
قرمە قرمی گوللەی لە پڕ
گرمەی بۆمبای زەمین هەڵدڕ
زۆر دڵی کرد بە قوربانی
ئیستعمار و نۆکەرانی
نە بەخوێن، نەشتی دەگمەن
نە سامان و پیتی وەتەن

تێر خواردنیان بۆ، نەبوو، هەر
خوێن مژتر بوون لە جانەوەر
سێبەری سێدارە و هی پەت
لەسەر روو نەخشێك بوو، خەت خەت
ئاسمانیش هەر رەنگی لێڵ بوو
ئەستێرەش لای من هەر وێڵ بوو
گوڵ لە لام گەشی تیا نەبوو
هەر لە گوڵی بەردین ئەچوو
بەڵام ئەمڕۆ کە ئازادین
ئینجا ئەزانم چیە (ژین)
ئەستێرە، وەکو زیندوو بن
لە ناو ئاسمانێکا بێ بن
یاری ئەکەن ئەجریوێنن
جوانترین دیمەن ئەنوێنن
گوڵیش ئەڵێ ی پەڕەکانی
لێ ی نوسراوە – کامەرانی–
جاران خاك بە خوێناو ئاڵ بوو
تامی ژیانی گەل تاڵ بوو
هەر زرەی زنجیر بوو ئەهات
زیندانێك بوو یەکسەر وڵات

خوێناو جۆگەلەی هەڵ ئەبەست
کەلەپچە مەچەکی ئەگـــەست
لە تاریکایی زینـــدانا
لەگەڵ زنجیری گرانا
ئەژیاین و دڵمان پڕ لە قین
بۆ ڕۆژێکی وا ئاگرین
دەمێك بیری تۆڵە سەندن
تاوێ خولیای خوێناو ڕشتن
یا ساتێ بەچاوی خەیاڵ
ئەماندی نیشتمانی ئاڵ:
بەهەشتە، جوانە، ڕازاوە
بە گوڵ، بە نیگار، نەخشاوە
پڕە لە خواردنی بەتام
ئاوابوو، ئەژیاین بۆ ئەنجام
نان" تەنیا نان داواکردن
تاوانێك بوو، وەك پیاو کوشتن
خۆ باسی سەربەستی و خۆشی
یەعنی (لێدان تا بێ هۆشی)
دایە گیان جارێکیان جەژن
جەژنی قوربان بوو، بەڵام من

لە جیاتی جەژنێکی بەتام
هاتن تیر و پریان لێ دام
کە ئەمانوت ئێمە کوردین
هەر چاك بوو، نە یان ئەکوشتین
خۆ زۆریشمان، وا لێ کوژرا
زۆر لاوی شەنگ، خنکێنرا
دوێنێ بوو، (عیزەت)، (قودسی)گیان
(خۆشناو)و، (خەیری) قارەمان
گەردنیان کردن بە پەتا
مردن، لە رێگەی میللەتا
ئەوانە، لەسەر کورد کوژران
لە رێ ی گەلا خنکێنران
بەکر، ئەی شەهیدی شیرین
ئەی رەمزی هەوڵ و نەبەزین
لە بیرمە، سەرت کە شەق بوو
رەنگی سوور، وەکو شەبەق بوو
بیرمە نەیا هێشت بۆ دوا جار
سەیرێکت بکەم ئەی نازدار
لەسەر کۆمەڵێ رِم، تفەنگ
درِندەکان بێ دەنگ، بێ دەنگ

بردیانی بۆ گردی سەیوان
قەدەغە بوو، هاتن ، گریان
کێ گریا بوو ناوی نووسرا
زۆر ژن و کچیش بانگ کرا
ئەختەری قارەمانی ژن
شەوەکە! روو بە رووی مردن
بانگی ئەکرد ( هەر بژی کورد)
بۆ، کوردە، ئەمرین گەورە و ورد
خوێنی کە رژایە زەوی
نووسی (دوژمن هەر ئەنەوی):
دوژمن سبەینێ لاشەکەت
وەکو بەرازێك ئەکەن پەت
ئاوا ئەوسا کورد پەروەری
لێ ی نوسرابوو: (نەکەی ئەمری)

* * *

منالّ لەسەر سنگی گەرم
لە باخی سنگێکا نەرم
لەگەلّ خورپەیەکا وەك: مەل
ئەکەوتە جۆشی پەلە پەل

یان گوڵـلـەیەك بێ بەزەیی
ئەیسمی کوڵمی پەمەیی
ئەمەیی! شیر و خوێنی گەش
ئەمرد، دەمی سوور، چاوی رەش

* * *

دایە گیان مەگری وەك جاران
ئیتر، نامبەنەوە زیندان
دڵنیا، بە، دوشمنەکەم
من زنجیری لـەپێ ئەکەم
من پێ ی ئەڵێم زیندانت
دانا، بۆ هاو نیشتمانت
دات نا، بۆ خوێن مژینی گەل
بۆ خوێن ناردن بە پەلـە پەل
خوێن..! بۆ کوێ؟ بۆ شاری لـەندەن
بۆ دوشمنەکانی وەتەن
تۆ زیندانت دانا و کەچی
خۆت تیا ئەمری بە مل کەچی
گەر ئەشپرسی بۆ بەم رەنگە
ناخۆش و تاریك و تەنگە

دوشمن من پێت ئەڵێم کەوا
خۆت بووی، بنچینەیت دانا
خۆت بووی، وا بۆت کردین کون برِ
لەشت تیایا ئەکرد ونجرِ
قامچیت لە ناویا ئەپچرِان
گیانت تیایا دا ئەرِزان
زۆر شەو، تانجی وەزیرە کۆن
ئەتانوت زووخاوتان بخۆن
نان نی یە، بە ئێوەی بدەین
ئێمەش ئاواتان لێ ئەکەین
دە تۆش دەردت بێ، بەشت بێ
خوێنی خۆت تێکەڵ، هەشت بێ
دانیشە سەرگەردانانە
کوشتان وەك کاسەی گریان
دەی زیاتر، زیاتر مل کەچ کەن
ئەی خائنەکانی وەتەن
دەك هەر خۆتان بە خۆتان بن
رەوایە بەم چەشنە بمرن
رەوایە ئاوا پەت کران
بەڵێ هەق بوو ونجرِ کران

* * *

ئەم کوردستانە شیرینە
کە سەرچاوەی خۆشی ژینە
باخەکانی گەردی خەمی
لێ باری بوو دۆڵی چەمی
خوێناو بوو هاژە هاژ تیایا
ئەڕۆی، لە دەشت و چیایا
کوردستان ئاسمانی شینی
باخی پڕ گوڵی رەنگینی
لە دەمێکەوە بوو، خەفەت
پیا دابوو، پەردەی مەینەت
کوردستانی وەکو بە هەشت
زۆردار کردبووی بەجێ ی گەشت
هاوینەهەواری نازدار
بوو، بوو، بە بەهەشتی زۆردار
جوانی سروشت و هی ئافرەت
لە عەزرەت ئازاری میللەت
ژاکابوو، وەك گوڵی پایز
خەمگین بوو، کورد، کوردی ئازیز
*　　　*　　　*

نەیان ئەهێشت تەرمی پیرۆز
تەرمەکەی شێخ مەحمووی دڵسۆز
بە سەربەستێوە بنێژن
نەئەبوو، ئەشکیش برێژن
دوژمنی کورد بە بێ شەرمی
هەتا وەکو، لەشی، تەرمی
دایەوە بەر گوللە دیسان
بە کۆچ کردوویتیش قارەمان
لەشی وەك بێژنگ کون کون بوو
خوێنی دەماری کورد هەڵچوو
پەلامار درایەوە و گیان
ئەوەری، وەك گەڵای خەزان

* * *

کوردستانی نازداری جوان
کوردستان خاکی قارەمان
کوردستان گلێنەی چەم
کەوتبووە ناو گەرداوی خەم
خوێن ئەباری لە ئاسمانی
ئەسرین ئەتەقی وەك کانی
کام ئاوازە زۆر نیان بوو
وەکو شەماڵی بەیان بوو

کام نەغمە بە جۆش، یا، مەنگ بوو
کام گۆرانی هی ئاهەنگ بوو
وشەی ئاگری تۆڵەو قین
لەناویانا هەر ئەلەرزین
بوو بووین بە پشکۆ، بە ئاگر
ئێمەی کورد، کورد، کوردی نەمر
بەم چەشنە ژیانی پێش
ئاگر بوو، خەم بوو، جەفا بوو
لێدان بوو، زیندان بوو، کوشتن
هاوار بوو، بانگ بوو، خەم چەشتن
گریان بوو، رۆ، رۆ، سنگ کوتان
نرکە بوو، هەوڵ بۆ ژیان
بەڵام ئەمڕۆ، وا ئازادی
کردی بە ئاهەنگ و شادی

* * *

کوردستان بووکی نەشمیلە
هاتۆتە دەرێ لە ژیلە
کۆتی دیلیێتیمان یەکسەر
پچڕان، نەیما، ئەڵقە و جەمسەر

خاوەنی کۆشکی خوێناوی
ئەزانم جگەر بڕاوی
جگەرگۆشەکەت، گوێت لیٚ یە
لاشەکەت شوێنی ژێر پیٚ یە
کوردی چەشەی سزا چەشتن
پەرۆشە بۆ، تۆڵە، سەندن
ئەی کچانی برا کوژراو
دایکانی کوڕ لە دار دراو
ئەی تیکە(لیٚ) فڕێنراو
ئەی لەشکری گڕ و خوێناو
ئەو، وشەیەی کە تەزی بوو
وشەیەك بوو، سەربەرزی بوو
وشەیەك لەسەر گوڵی دەم
بوو، بوو بە تەرزە، لە تاو خەم
با وەك گوڵ بەسەر ژیانا
لەگەڵ بەستەی کۆڵ نەدانا
بیبارێنینە ناو باخیٚ
پڕی بوو، لە چەشنە داخیٚ
گوڵ خونچەکانی ژاکا بوون
گوڵ بوون و لە چقڵ ئەچوون

* * *

کەلەپچەمان پسان دوژمن
پەتت ناگاتەوە گەردن
ئەمڕۆ جەژنە هی ئازادی
بۆ کورد و عەرەب بەشادی

*   *   *

ئەی هاو دەمی جامانە سوور
کە، گەڕایتەوە شوێنی دوور
کاکە، کە چوویتەوە بەرزان
بەرزان، خاکی بازی، بازان
سڵاوی من بگەیەنە
بەو شوێنەی ڕەنگی وەك خوێنە
بڵێ بە خاڵۆی سایەی توو
(ڕۆژانی دیلی بەسەرچوو)
بڵێ بە برای بەرزانی
تۆ... کە خۆشەوستی گیانی
تۆ کە گلێنەی دیپەمی
مژدەبێ وا دیلی تەمی :
ڕەویوە، ناسۆر، وەك بەفر
توانیوە، هەوڵی وەك ئاگر

ئەوی ئەشکی وەك مرواری
ئەنارد بۆ لەندەن بە دیاری
لەم رۆژانەدا پەتمان کرد
مرد بەلاّم چۆن مردنێك مرد !!!

*      *      *

ئەمرۆ بەیان تیشکی ئاڵتوون
دای لە دجلەی شیرینی روون
تانك، وەکو هێزێکی زیندوو
بە بەردەمما کە تێپەڕ بوو
ساڵی پارم بیر کەوتەوە
یادی رابردووم خواردەوە
ئەمجارەیان سەربازەکان
روو مۆن نەبوون، وەکو جاران
بریسکەی رەنجیان لەسەر روو
پڕبوو لە شەوق و ئارەزوو
وتم بژی برایەتی
خۆش بێ خۆشەویستی پەتی

١٩٥٨/٧/١٦

# نامه

کاتێ کە نامەکەت گەیشت
پەپوولە گوڵاڵەی ئەکوشت
دەشتی دڵم بە سام و مات
هیچ جریوەی لێ نەئەهات
بەڵام کە زانیم تۆش وەك من
بێ باکی لە سزای دوژمن
خونچەی شادمانیم پشکووت
گەش بووە وەکو لێو و رووت
زیندانەکەم رووناك بۆوە
ئازاری سزام بیر چۆوە
ئەی فریشتەی دڵی گەرمم
وەرە لام ئەو کاتەی ئەمرم

بلێ ئازا بوو یارەکەم
ئەیووت ئەبێ مل کەچ نەکەم
گیانم کە بوو بە پەپوولە
دێمە ناو ئەو قژە لوولە
لەگەڵ لەرزەی باڵا ورد ورد
هۆنراوە ئەچنم بۆ کورد
بەسیمی هۆنراوەی گیانی
بەرگی ڕەشت بە پەنهانی
ئەنەخشێنم بەم وشانە
ژینی دڵسۆز تێکۆشانە

کام هۆنراوە ناسکە و تامی تیایە
لە لای ئێوە زۆر تفت و بێ بەهایە
هونەری جوان، زانست هەمووی بەجارێ
ئێوە ئەیکەن بە قوربانی دیناری

هەوری خەمگین تا دانەڕێژێ
بارانێ هەمووی خوێن و ئەسرین بێ
سەمتووری ژیان تا هەڵنەڕێژێ
ئاوازێ سەرجەم ناسۆر و شین بێ
نە گوڵی ئاوات دێتە شنەشن
نە ئاوازەکەی شادی ئەبیستن

ئەگەر ژێر کەوتوو ئەسرین نەڕێژێ
سەرکەوتوو تامی زاڵ بوون ناچێژێ

# ناسك

ناسك ناسك...
بەرگەردن و کوڵم و باسك
ناسکە ئەندامی لەشی
ڕوومەت، لامل، کوڵمی گەشی
سنگی ئاستی درزی بلووز
پێستی ئێجگار ناسکی پووز
پێوپلی سپی وەك بەفر
بە پریشکی نیگای ئاگر
لەوانە وەك بەفر، یا مۆم
بتوێنەوە ناو پێڵووی خۆم
* * *
ناسك ناسك
بەرگەردن و کوڵم و باسك
* * *

لە دڵی فریشتەی دڵما
لە چاوی ئەشکی بە کوڵما
ئەم جوانە هەروەکو پەری
لەگەڵ دڵی منا ئەگری
چونکە گەردەلوولی ژیان
ئەیبا بەرەو دەشتی گریان
دڵی ناسکی ئەشکێنن
نازانن ناسك بدوێنن
کێ بێ نازی ئەو هەڵگرێ
تا ئەو ناسکی یە نەمرێ
نرخی ناسکۆڵەیی جوانێ
مەگەر هەر شاعیر بزانێ
ناسك ناسك
بەرگەردن و کوڵم و باسك.

## پاییزی روو زەرد

پاییزی روو زەرد، پاییزی خەمگین
دیسان ژیانی باخی کرد بە شین
بەرگی بەسامی ماتەمی پۆشی
لە خوێنی گوڵی گوێ چەمی نۆشی
پۆپەی نەرمی تەڕ شکایە ناو ئاو
وەری، تاڵ تاڵی گوڵی زەرد و خاو
پەڕەی لالەی ناشت لە توێ توێ ی خاکا
لەگەڵ بروسکە و ناڵەی ناپاکا
پەڵەی هەوری رەش ئاسمانی پڕ کرد
ئەو خونچە جوانەی دوێنێ تەڕبوو، مرد!
ملوانکەی شەونم لە ملی گوڵا...
بەبای رەنگ زەردی پەشێوی پچڕا
گوڵی زەرد و سوور کەوتە لیتەوە
پایز ئەڵێ: دەك هەڵنەسێتەوە
هۆزار، خرایە ناو هێلانەی خەم
خڵتانی خوێنە، بەری چاوی تەم
ئەی بەهار، ئەی گوڵ، ئەی لالەی نازدار
ئەی چڵی نەرم، ئەی مەل و هۆزار
خەم مەخۆن گەرچی ئەمڕۆ ماتەمە
پاییزی زەردە، جەخارە، خەمە

ئەگەر چی رەنگی بەهار پژاوە
کاسەی شەونمی شیرین رژاوە
بەلاَم سبەینیّ بەهاردیّتەوە
ئەو تۆوەی رژا هەلّئەسیّتەوە
ئەو چلّەی شکا دیّتە شنەشن
گژ و گیا و گولّزار ئەروێ تا گەردن
خۆرەتاوی زیّرِ لەسەر گولّی جوان
بریسکەی ئەدا لە سنگی ئاسمان
ئەی پایز، بەسە هەرِەشە و نالّە
ئەم ژینەی ئەمرِۆ وا ترش و تالّە!
ناگاتە ئەوەی مردن بخوازین
بە هیوای (گەش و ئالّمان) ئەنازین
باخی ژین زۆری دیوە لەم چەشنە
بەلاَم هەر شادی هاتۆتە شنە
من لەناو دلّما هەر لالە زارە
هەمیشە بەهار رۆژی بەهارە
ئاسۆی دلّ گەشە، رووناکە، جوانە
پرِ لە ئاهەنگی خۆشی ژیانە!

# فەرامۆشی

ئەڵێم با پرشنگی چاوی
قژی وەکو خۆرەتاوی
بریسکەی دەمی بچووکی
بەژنی جوان و ئێسکی سووکی
کوڵمی وەکو گوڵە سووری
لا ملی وەکو بلووری
لێوی پڕ لە تەزووی خۆشی
بدەمە دەست فەرامۆشی
کەچی دڵ ئەڵێ من ناژیم
بەبێ خۆشەویستی پەریم

ژین لەلای دڵسۆز هەر تێکۆشانە
هەوڵە بۆ خاکی ئەم کوردستانە
خۆزگە ئەندازەی ژیان و تەمەن
تێکۆشان بوایە بۆ خاکی وەتەن
( ئاخۆ تەمەنی کام دڵسۆزی کورد)
( لە چوار پێنج ساڵێ تێپەڕی ئەکرد)

هەنسکی دایکی نیشتمانەکەت
پشکۆی هەڵمەتی گیانی خۆش کردی
هاوڕێم بۆ کورد و کوردستانەکەت
کۆچت کرد بۆیە من ناڵێم مردی

## ئەی کچە شوان

ئەی کچە شوان....،
هەلاڵەیی
ئەی کەنیزەی کەژی کوێستان
بەشێنەیی
نەرم و نیان
بە ئاوازی شمشاڵەکەت
بە لەرەی لێوە ئاڵەکەت
هەستی خۆشیم بێنە فڕین
بۆ ناو گوڵزار
چەم و نزار
ئاسمانی شین،
لادە لە خەم
ئەی گوڵی چەم
ئەی کەنیشکە وردیلەکە
ئەی گولاڵە نەشمیلەکە
ئەگریجەی رەش
ئەی دیدە گەش
ئەی کچە شوان!

*　　　*　　　*

ئەی کچە شوان
ئەم چەم و دەشتە شیرینە
ئەم چیاو دۆڵە رەنگینە
تا دوێنێ بوو
لیتە و لێشاو بوو، تەپوونم
گیانی گوڵان بوون ئەوەرین
وا تۆوی گوڵ بوژایەوە
گوڵی مردوو ژیایەوە
لە گوێ ئاوی قەڵبەزی کەڕ
دڵۆپ هەڵئەستێ وەکو پەڕ
یا وەك پەپوولەی ناسکۆڵە
بە تیشکی گزنگ زەرد و سوور
بنوارە ئەو شەوبۆ وردە
لەسەر ئەو تاوێرە بەردە
فریشتەی هیوا بگرە کۆش
بە ناسۆر تۆ مەبە سەرخۆش
بابێ دەنگی شمشاڵەکەت
لەرەی بێ لێوە ئاڵەکەت
بە ئاوازی کامەرانی
نەرم نەرم زۆر بەجوانی
گەردن هەتاو
ئەگریجە خاو

ئەی کچە شوان

ئەی بولبولی خۆش ئاوازە

گوێ بگرە لە سۆزی تازە

دیمەنی سروشت ڕەنگاوڕەنگ

جریوەی تۆ زۆر بە ئاهەنگ

پەری هیوا کەوتە فڕین

فڕی بە کوڵ

لە دۆڵەوە بۆ نزاری داوێن ڕەنگین

لەگەڵ شەماڵ

سەری دەرکرد گوڵاڵەی ئاڵ

فرمێسکی ئاڵت بسڕەوە

کاتی (تێ کۆشانە) و زەردە

ئاوی شەونم بخۆرەوە

هیوا هەرگیز

ئارامی کۆرپەی ژیانە

ئەی کەنیشکی جوانی ئازیز

گوڵی بەهار

کچی نازدار

ئەی کچە شوان

## مەرگی سێبەر

فریشتەی شەبەق لە درزی
کەژاوەکەی خۆر دابەزی
پیَ ی نایە چەمی مرواری
ورشەی بۆ هێنا بەدیاری
(گڵەزەردە)ی جوان، گەردن کەش
رازایەوە بە گوڵی گەش.
کچی خنجیلانەی نازدار
رژانە سەر فەرشی بەهار
داری شێخە باس، سێبەری
بوو، بە، چەتری شێوە پەری

* * *

چەن جوانە ورشەی قەنەوز
تێکەڵ بە نیگای چاو نێرگز
لەرەی دەسماڵ، پوولەکە رێز
دڵی دڵدار ئەکا بیَ هێز
کچۆڵەی بەژن و باڵا بەرز
بە ترپەی نەرمی پانی بەرز
وەکو فریشتەی ناو بەهەشت
ئاوازێکی ئەدا بە دەشت

چۆن ئاوازێك، تا بلێ ی خۆش
نەغمەیەکی ئێجگار بە جۆش
لەسەر نقامی زوڕنا ژەن
نەرم، ئەلەرێوە بە دەن
(کراس) کە تانێك بوو تەنك
(کەوا) شیرداخێکی ناسك
ورشەی شیرینی کەمەر چین
کە ئەیدا لە خامەکی شین
دڵ ئەگریا و پێ ئەکەنی
سەد دڵ ئەیوت ئای لە بەژنی
گیلْ گێلە و پشتەسەر، کرمەك
ملەگۆی، سەر سوخمەی خامەك
هاڕەی لەم چەشنانە خشڵ
رائیەپەڕان پەپوولەی دڵ
کوڕیش، سەڵتەکەی چۆغەی شین
فەقیانەکەی سپی بەفرین
مشکی و جامانەی تێك ئالا و
بۆی شەیدابوو ئەگریجەی خاو
سەماوەری وەرشاو و زەرد
وەکوو، زیوو زێڕی بێ گەرد

تاکو نیوەی بە سەوزە گیا
بە تەبیعەت ئەپۆشرا.
چەند خۆشە لە قۆری عەجەم
بۆم تێکا، چایەك نوقڵە دەم
وای لەڕەوتی کڵاو ئاڵتوون
زۆر هەرزەکاری بۆ مردوون
لکی سەرپۆشی پوولەکە
لەسەر ئەو سوخمە خامەکە
بریسك و هۆڕ وەکو ئاسمان
لەسەر باخی سنگێکی پان
چارشێوی جوانی نۆ کەمەر
بێ ئارام بوو لەسەر کەمەر
کوڕی عەبای (دۆخ سورمە) پۆش
دڵی فیزی ئەهاتە جۆش
پیاوی نێرگەلەی زیوین کێش
دڵی کەیلی ئاوات و ئێش
بۆنی مێخەك و هی سمڵ
غەمزەی بەنازی روومەت گوڵ
هاڕەی پێکەنین، هەیاسە
ئەبوون بە شەپۆلی تاسە

پۆل پۆل لە دەوری سەماوەر
دائەنیشن لەژێر سێبەر
سێبەر بەڵام هی یەك درەخت
سێبەری دەشتاییەك تەخت
هەر شێخ هەباس بوو بە تەنیا
سێبەری ئەڕشتە سەر گیا
لە سەد لاوە بە دیلانە
ئەگێرا ئەو دارە جوانە
چاو رەش و چاو کاڵی خرپن
باریکەلە و شۆخ و گۆشتن
بە دەنگێکی زۆر سازگار
فریشتەکان، کچی نازدار
گۆرانیان ئەوت... بەستە
چڵ بە مردووی ئەوت هەستە
ئەرخەوان ئەیوت سەیرکەن
چەند جوانە گژوگیا و چیمەن
فەقێ لەتاو سوخمە خامەك
کۆڕێکیان ئەگرت هی کەوشەك
مەلای رووخۆش، کە، دا، ئەبوو
سوختەش بە سەریا هەڵئەچوو

ئەی دارەکەی شێخەباس ئاخ
لە دڵی منا، بووی بە داخ
هاتن سەربازی عوسمانی
نارمەدانە سوتانیانی
لەتاو سەرماو سۆڵەی بەفر
لقیان شکانی بۆ، ئاگر
ئەو یادەش ئەو رابردووە
لە دڵی منا نوستووە
هەزاران یادی وا بەسوێ
دێنەوە بیرمان سەرلەنوێ
ئەی دارەکە هەر بە بیستن
من کەوتمە خەفەت رشتن
( مرد سێبەرەکەی شێخەباس)
(سووتا درەختەکەی هەباس)

کرێوەی ناسۆر، لە کێوی ژینا
لە گیان و دڵی بێ هێز و تینا
لوول ئەخوا لەناو دەمی برینا
گریەم دێتە گوێ لە نەغمەی بینا
بەڵام بەستەی خەم لە دەمم نایە
گۆرانیم تەنیا نەغمەی (هیوایە)

لام وایە نزمی، بۆیە سەربەرزی
بە زێڕ دا ئەنێ ی پێوەی ئەنازی

ئەوی لە سامان نزیك بێتەوە
ڕەوشتی بەرزی بیر ئەچێتەوە

# په نجه‌ی ته‌زیوو

زه‌رده په‌ڕی، کالّی زێڕین
ئه‌تویێته‌وه... ده‌شتی به‌فرین
تۆپه‌لّی به‌فر، له‌سه‌ر چڵ
له پڕ ئه‌ڕژێته‌وه جه‌رگی گڵ
مه‌لی ده‌نگ خۆش، وردیلانه
ئه‌گه‌ڕێته‌وه.... هێلانه
دره‌ختی پیر، ئه‌لّێ من چیم!!
به سه‌رمای تیژ ئه‌لّێ: (ته‌سلیم!!)
شاخ و رووبار و.... دارستان
ئه‌ترسن له به‌فر و باران
تاوێك ره‌هێڵه‌یه به‌تین
ده‌مێك به گوڕ به‌فر بارین
منالّێکی شه‌ش حه‌وت سالاّن
ئه‌گه‌ڕێ، ئه‌گری، له کۆلاّن
با.... له ناو، به‌فرا ئه‌ته‌زێ
چرۆی دره‌ختی ته‌ڕ ئه‌مرێ
(هیوا)، ئه‌نواڕێته ناو ژوور
ته‌لاری به‌رزی زه‌رد و سوور
له پێش بونیا بوو... باوکی مرد
له‌گه‌ڵ دایکی... سوالّی ئه‌کرد

دایکیشی سیلی پڕ لە ژان
رای کێشایە ناو گۆڕستان!
شەوە... ئاوازە، رەنگاورەنگ
لەو ماڵەیە، بەستەیە ئاهەنگ
لەپاڵ دیوارێکدا خەمگین
دائەنیشێ (هیوا)ی شیرین
ئەندامی ورد، لەشی، گەردن
هەموو لەگەڵ یەك ئەلەرزن
دوای هەناسەیەك دەس گێڕان
لە کونوو قووژبنی گیرفان
نەختێك شقارتە دەردێنێ
یەك یەك دایان ئەگیرسێنێ
لەبەر تیشکی گڕی بچووك
منالی برسی ئێسك سووك
دا ئەنیشێ تا دوا دەنك
ئەگرێ، بۆ پەنجەی ناسك

سەرئەنێتە سەر لەپی دەس
ئەنوێ بەسزمانی بێ کەس!!!
دوای هەناسەیەك ڕێبوارێ
تێ ئەپەڕێ و پیا ئەنوارێ
هەڵی ئەگرێ و ئەڵێ: (فەرموو!)
ئەم شەو، لای مامی خۆت بنوو.
بەڵام ئاخ، پاش چی!! تازە مرد
( چاوەڕێ ی پرشنگی ئەکرد.....)

## بووکی لادێ

چاوی، کاڵیان، ئەڕشت بە کل
بۆیان پێچا، سەربێچی زل
ملوانکەی دەنك گەورەی زەرد
نیشتە سەر، سنگێکی بێ گەرد
کراسیان پۆشی، شین، تەنك
خەنە، نەخشی، پەنجەی ناسك
پانی بەرزەکەی رەنگاوڕەنگ
هەیاسە، بۆ کەمەری تەنگ
بووك، رازایەوە، رەنگ سەد جۆر
وەك باخی بەهاری بەر خۆر
کەوای سورمەی خواستەمەنی
پۆشی ئەندامی بەدەنی
دەسماڵی، پووڵەکە چن، ئاڵ
ئاڵا، لە درزی سینەی کاڵ
سوخمەی، گورروونی ی گوڵ گەورەش
سنگی کفی گرتە باوەش!.
رەش بەڵەکیان، رێك خست گەرم
هەڵپەڕکێ ی چەپی بوو.... نەرم

پەنجەی نەرم ۆ شل و نازدار
ئالا لە دەست و پەنجەی یار
تلك تلك ئارەقی رووی وەك گوڵ
ئەیگرت بۆنی مێخەك، سمڵ
زاواش کەڵەگەت، شۆخوشەنگ
ناوشانی پان، سەرنجی مەنگ
سەریان قۆچکە تاش کرد.... جوان جوان
دای دابۆوە، فەقیانەی پان
سمێڵی قیت،.... قەترانی رەش
روومەتی پان و چاوی گەش
بووك خرایە، رێ، بۆ، جووتیار
لەم زنجەوە، بۆ ئەو دەوار
ئاغاش بەفیز دێت و ئەچێ
ورد، ورد نەرم هەنگاو ئەنێ
هەروا دوای دوو سێ مانگی تر
بەر بوو لە گیانی بەگ ئاگر

پیلان، تاڵ تاڵ چنیان بۆی
زۆر ڕێگه و شوێنی دانا خۆی
ناردی به شوێن زاوای شەنگا
له تاریکی شەوە زەنگا..
ناردی بۆ فرمانێك بێ دەنگ
ناردیشیه، سەر ڕێگای تفەنگ
له نیوه شەودا، کوتوپڕ
دەست ڕێژێکیان لێ کرد له پڕ
کوشتیان، ئاغاش فرمێسکی ڕشت!!
بمزانیایه کێ بوو.... ئەمکوشت!!
کێ بوو، کوشتی جووتیاری من
وا دیاره وێڵه بۆ مردن!!
دوای فرمێسکی درۆ، ڕشتن
بەڵێنی (تاوانبار) کوشتن
ژنی جووتیاری ماره کرد
خونچەی (تازه پشکوتوی) برد!

## پرسیار؟ [١]

بەژنی تۆ یا بــە ژنی ڤینۆس ئەی فریشتەم شەنگترە
خونچە تەنگ تر، یا دەمی تۆ، یا دڵی من تەنگترە؟
چاوی کاڵی پڕ لە ورشەت، یا گەلاوێژ گەشترە
خاڵی گۆنای ناسکت، یا بەختەکەی من رەشترە؟
دەنگی دڵ بزوێنی تۆ یا شیعری من پڕ سۆزترە
پەرچەمی رێحانەییت یا رۆژگار ئاڵۆزترە؟
عەشقی من، یا گیانی ساوا، یا فریشتە پاکترە
ژینی جیایی یا مەرگ کامیان لە کامیان چاکترە؟

[١] ئەم هۆنراوەیە لـە فارسییەوە وەرگێڕدراوە بە دەستکارییەوە.

# میوەی نازدار

کات بەیانی... پرشنگی کاڵ
پەرشی گۆنای، گوڵاڵەی ئاڵ
کوڕی شۆخو شەنگی پێست ڕەش
چەپکێك گوڵ ئەگرێتە باوەش
دێت بۆ لای یاری نازەنین
دوای سکاڵا و ڕازی شیرین
بەڵێن ئەبەستن – بەیانی–
بێنەوە، بۆ باخ و کانی
لەوێ لەگەڵ جریوەدا
تێر تێر لەو چەم و شیوەدا
گۆرانی خۆش بڵێن هی خۆش
بە بادەی دڵ ببن سەرخۆش
بەیانی، وەك دوێنێ هەر دوو
ڕویان کردە سەرکانی، زوو
شاجوانی ڕەشتاڵەی نازدار
کراسی مۆر، بریسکە دار

وەك گوڵە قەیفەیەكی تەڕ

هات، بەرەو ئاو، سێبەری كەڕ

یار لەوێ بوو..... بەڵام لەسەر!!

درەختێكی زڕی، بێ بەر !!

وەكو میوەیەك سەرەو خوار

هەڵواسرابوو... لاشەی یار

شوێنێك، بووبێت، بە پەرستگە

بۆ دۆلاری خاوەن (كارگە)

تیابێ نرخە، گیانی هەژار

بەتایبەتی (فۆڵی) نازدار

چاوم هەڵ هێنا دیم ئەم میللەتە
دیمەنی ژینی قەنارە و پەتە
گوێم بە دەنگی (ئاخ) زرنگایەوە
دەمم بە هاوار هەڵ هێنایەوە
بۆیە هەر ئەبێ پشکۆی تۆڵە بم
قوربانی خاك و هی ئەم خۆڵە بم

کاتێ دیم ئەسرین لە تەختی رووتا
وەك پشکۆی گەشی ئاگر ئەسووتا
هەزاران مەشخەڵ لە دڵما رووا
دوا پەردەی سامی بەرچاوم پووا
دایە گیان مەگری ئەو چەکەم بەرێ
سنگم یا گوللە، یا ئالاّ ئەگرێ

کە تاڤگەی خوێناو لە سنگی کەژا
پەڕەی دڵانی کوردی تێ رژا
گوللەیەك دڵی گەرمم ئەپێکێ
هەر کە قەترەی خوێن لە سنگم رژا
گوڵ لە بەر پێما ئەگەشێتەوە
لە سنگی منا رۆژ ئەبێتەوە.

# دڵی تەنیا

دڵی پێخەفی... تەنیا
بۆ دووری من ئەگریا
کە کردیانە پێم ئاسن
پێ ی نەچەمێوە، گەردن
تەزوویەکم پیا ئەهات
وەکو شەماڵی ئاوات
کەشتی ئاوات، رەنگ ئاڵتوون
لە ناو رووباری دەروون
پەردەی سپی کردەوە
ئاڵاکەی هەڵکردەوە!
کە پێوەند زرەی هەستا
چرای تۆڵەم هەڵکرا
مانگ دەمی ماچ کردم... گەش
هات و من، گرتمە باوەش
شەماڵ بە بەستەی شیرین
دەریا شەپۆلی رەنگین
سروودیان ئەوت بۆ دڵ
گەشامەوە، وەکو گوڵ

ئاوێتەی ڕەنگی گەشی سوور و شین
لە ناخی دڵی ئاگرما ئەژی
بیری تۆڵەیە و هی ناسۆری ژین
تا دوا دڵۆپی ئۆقرەمی مژی
تەنیا بە خوێنی ئاڵی خوێن سەندن
ئەگەشێتەوە گوڵی ئۆقرەی من

گیانێ بۆ بەرزی کورد و کوردستان
لە ئەڵقەی پەتا بگاتە مردن
یا لە کوشتارا کاتی کۆڵ نەدان
هەڵوەرێتە خاك بە گوللەی دوژمن
ئەو گیانە پاکە ئەبێ بە گیانی
ئەوانەی ئەمرن بۆ کامەرانی

## شەوانی سلێمانی

شەقامەکان و گەڵای زەرد
کووچە و هەزاران دڵی بەرد
لە کۆشی شەوێکا بوون مات
شادی ورتەی لێ نەئەهات
لە ژێر پۆستاڵ واڵای بووک
میزراحی کوڕی ئێسك سووك
پێشێل بوون لەگەڵ چاوی جوان
خونچەی رووومەتی مناڵان
بیگرن سنگی کف و نەرمە
لەش و لاری جوان و گەرمە
راوەستە، دەمت، ماچی دەم
با سەرسنگیشت ماچ بکەم
شیتاڵ دەری خست سنگی پان
تێ ی رژا تریفەی ئاسمان
دوژمنی رسواو ترسنۆك
بۆ دیلی شەنگ هاتە سەرچۆك
دەمی گۆشی شیری ئەتك
خۆی سوو لە رووومەتی ناسك

ژنە کوردی دیل بانگی کرد:
( ئابڕووی دڕەندەشتان برد)
ئێوە و گەورەکەشتان سووکن
پەروەردەی باوەشی ئەتکن
ئەمەی وت و خۆی ڕاتەکان
مێشکی خۆی بە بەردێك پژان
دوای تاوێك کوڕانی گەڕەك
تێکیان شکان دوژمن و چەك

# پەشیمانی

وتم: بە گوڵی پایزی وەریو
بە خونچەی وردی ناو شەپۆلی شێو
بەو مەلە جوانەی تا مەلا بانگدان
بۆ عەتری رووی گوڵ ئەیکا بە گریان
دەمەو بەیانی خەو بەبێ دەنگی
ئەرژێتە چاوی، ناو دڵی تەنگی
کە دێتە ناو چەم تیشکی خۆرەتاو
ئەوسا هەڵئەسێ دەمەو چێشتەنگاو
وتم: بەو تیشکەی بەیانی زوو زوو
هەڵدێ لە ئاسۆی روونا کی سوور بوو
لە پڕ هەورێکی بێ بەزەیی تاڵ
ئەیپۆشێ تاڵی تیشکی سووری کاڵ
وتم: بەشەوبۆ کە مات مات لەدۆڵ
نەگەشایەوە، کەژ، بوو بە سەهۆڵ
وتم: ((پرشنگی نیگاری گەرم و خۆش))
((بزەی دەمی تۆ، گیانە فەرامۆش))

فەرامۆش یادی شیرینی جاران
ناوم سڕیەوە لای خوای دڵداران
کە چی لە چاوی کل نەدیوەوە
لە دڵی نەرمی هەڵفڕیوەوە
هەمیسان تاسە ڕژایە دەروون
دوو دڵۆپ ئەشکم وەك قەترەی ئاڵتوون
گەرم و ئاڵ لەسەر رووی من قەتیس مان
بۆ هاتیتەوە ئەی کچۆڵە جوان؟
وەك دڵمت ڕەنجان، بۆ دیسان بزە
هەڵکا، چراکەی، ئەم دڵە کزە؟
وتی: ئەی یاری نازداری گیانم
تووبی، ئەم دڵە و خورپە و گریانم
ببوورە، سامان منی فڕیو، دا
منی بە نەختێك ئاڵتوون و زیو، دا
دامی بە کۆشك و، بە تەلاری خەم
ئاسمانی شادی گرتم بەماتەم
من ((پەشێمانم))، ببوورە ئەی یار
دڵم مەشکێنە، تۆ دڵی دڵدار
(دیسان تەوژمی دڵداری بە جۆش )
( وەك کۆرپەی نازدار، دڵمی گرتە کۆش )

# لایلایه

لە کەپرێکا دایکێ لە دڵی نەرمی
سۆزی ئەرشت بۆ کۆرپەکەی بەگەرمی
دەس و پەنجەی ساوای ناسك و خرپن
ورد ئەیماڵی بەسەرسنگا و، روو، گەردن
کۆرپەی نازدار لە باوەشی دڵسۆزا
لەگەڵ نەغمەی لایلایەی زۆر بەسۆزا
وردە وردە جوان ئەکەوتە خنەخن
گەش گەش ئەبوو غەبغەبە و کوڵمی گۆشتن
کام هۆنراوە زۆر هونەرچن و خۆشە
بەسۆز نەبوو وەك ئەو خەندە بە جۆشە
بەڵام لەپڕ ورووژمی گوللەی شەستیر
تك تك خوێنی تێکەڵ کرد بە قەترەی شیر
ئەنجنی کرد گۆی مەمك، دەمی وەك گوڵ
بێ دەنگی کرد لایلایەی خۆش و بە کوڵ
ئەو کەسانەی چەشەی خوێنی مناڵن
بۆ خوێنڕشتن، وێران کردن، عەوداڵن
خوێنی گەشیان لەناو ئەو باخەدا رشت
زەردەخەنە و لایلایەی شیرینیان کوشت
لێرەدا بوو گوڵی خەندە هەڵوەری
کیژی لادێ ئێستەش زۆر بە کوڵ ئەگری

به ئاڵتون کوڵمی ناسکی وەك گوڵ
ئەتوانن بەرن بەڵام هیوای دڵ
کڕینی نی یە وەکو ئەو گوڵە
چونکە نرخی دڵ تەنیا هەر دڵە

لە کێوی زەردی پایزا هەستم
دایڕشت بنچینەی قەڵاکەی هیوام
لە گەلاوێژا ژمارەی بیستم
کرد بە بەرواری پیرۆزی پەیام

# یاد

قژی نەرمت، وەکو تاڵی خۆرەتاو
لەسەر قۆڵو شانی سپی، پەرشوخاو
نەغمەی شیرین، ئاوازی خۆش لە دەنگا
ورشەی سەرنج، لەناو چاوێکی مەنگا
خاڵێکی کاڵ، نەخشێکی جوان، لەسەر روو
بەژن و باڵات، وردیلـــە و رێکـــو هەڵچوو
زەردەخەنەی ئەو رووە، هی ئەو لێوە
فریشتەی هەست، هی ئەم دڵە بزێوە
وای لێ ئەکات، بێتە سەما و گورانی
بیلەرزێنێ تەلی ئاوازی جوانی
درەختەکەی، سەرکانێکەی باخی چەم
پێ ئەکەنێ، گەڵای ئەڵێن: پڕ بەدەم
لە بیرمانە، مناڵ بوون لەناو باخا
زەردەی دەمتان، ئەدا بەپشتی داخا
تۆ بنوارە ئەو کانی یە نازدارە
ئێستەش وێنەی هەردوکمانی تیا دیارە

تۆم خۆش ئەوێت بەڵام نابم بە یەخسیر
لە تاوی قژ، بۆ دڵم بکەی زنجیر
نەشوانم بە، نەشوانت بم بەشمشاڵ
بۆ دڵێکی وشك، بکەین – پەڕوباڵ –
نەکوڕنوشت بۆ ئەبەم، نە تۆش بۆ من
با لە باخی شادیا، دەست لە گەردن
دوو دڵدار بین، بەراستی دوو فریشتە
ئەو ژیانە بەو جۆرە بێت بە هەشتە
لە گوڵی یاد، لە یادی جوانی رەنگین
پێشکەشت بێت چەپکێك گوڵاڵەی شیرین

# روو بە رووی مردن[٤]

سەرنجمان دا، ئـەڕۆی بێ دەنگ
لەم لاو، لەو لاویەوە... تفەنگ
بەرەو دەشتی، پڕ شنەشن
لەژێر پەردەی ئەستێرەچن
لەوێ نزیك ئاسۆی رووناك
كوژرا، بە تفەنگی.... ناپاك
چاویان لێك نا، پیاو كوژەكان
ملیان كەچ، سەریان دانـەوان
زاتیـــان نەبوو، تێ ی بنـــوارن
سەرنج بەن، لە چاوی، گەردن
بـــەدەم نـــوێـژەوە، ورتـــەیـان
بە پەردەی گوێ ی ژینی گەیان:
– تازە، رزگارت ناكا خواش
– تازە، رزگارت ناكا خواش

[٤] لە ساڵی (١٩٣٦)دا لەكاتێكا كە {لۆركا} ی بوێژی هەرە گەورەی (ئیسپانیا) یان برد بۆ كوشتن (دەست رێژ) (ئەنتۆنیۆ ماخادۆ)ی بوێژی گەورەی (ئیسپانیا) كە لە نەفی بوو ئەم هۆنراوەیەی بۆ ووت!

روومەت، خوێناوی، گوللەی رەش
پەراسویان، گرتە، باوەش
مردوو تاوانێکی، گران
روویدا، لەشاری بەسزمان
بەسزمان.... (غرناتە)ی شیرین
زۆر بەسزمانە..... ئەیزانین!!
دیمان، ئەرِۆی، لەگەڵ مەرگا
(ورە)، مەلاس، لەناو جەرگا
نەترسا، لە داسی مردن
لە زەبری، بەتینی کوشتن
رۆژ لە تەلارەوە و... دەسگا
چەکوش بە گوورِ خۆی پیا ئەدا
دەنگی بەسامی لێ ئەهات
– لۆرکا– ش، لەرِێ ی مەرگ و خەبات
لەگەڵ مردنا............ ئەدوا
گوێ ی لێ بوو... دەنگێ هەڵئەسا:
( هاورِێ هەموو هەر دوێنێ بوو
شەماڵ خۆی لە درەخت ئەسوو
گەڵای دار خورما ئەیچرِپان
بوو، بە تەرزە بەستەکەمان

به داسێکی تیژی زیوین
دەسو پیّ ی پەژارە، پەڕین)
بەم جۆرە، بەستە ئەڵێم من
بۆ ئەو لەشەی بردی مردن
بۆ ئەوە بەژنەی هی تۆ نەبوو
هی گەل بوو، ئەی برای زیندوو
بۆ ئەو قژەی پەرشی رووە
بۆ لێوی ئاڵ کە نوستووە
بۆ ئەو دەمەی لەمەوپێش دەم
ئەیمژی، خۆشەویستەکەم
چەند خۆشە، من ئێستە تەنیا
لەگەڵتا بوومایە..... برا
ئەی گیانی (غرناتە)ی ئازیز
بیرمان ناچێتەوە هەرگیز
دیمانن، ون ئەبوون لەچاو
بۆ ناو شەپۆلی خۆرەتاو

هاوڕێینە: لەناو بەردا
لە خەوی گەش و بێ گەردا
قووڵ ... لە کۆشکێکی رەنگ ئاڵا
لەناو بەردا..... لە خەیاڵا
لە ژێر کانیا.... قوڵەقوڵ
کە ئاوی روون، ئەگری بە کوڵ
گۆڕێك هەڵکەنن، بۆ شاعیر
بۆ {لۆرکا}.... بۆ گیانی نەمر
ئاوی کانی ئەگری بە خوڕ
تا ئەبەد ئەڵێ و دڵی پڕ:
{ لە غەرناتە جورمی (٣)گران
وەك درنج هەستایە سەر پیان!}

(٣) جورم - جەریمە

# قورتوبە[٦]

شاری (قورتوبە) تەنیایـە
ئەڵێ ی لـەوپەڕی دنیایە
ئەو شارە کۆمەڵە نوورە
تا بڵێ ی لە ئێمە دوورە
ئەسپێکی رەش مانگێکی روون
هەگبە کەمو، نەختێ زەیتـوون
ئەگەر چی، شارەزای رێگەم
بەڵام، بێ گومانە... ناگـــەم
ئەرِۆم، بەسـەر سنگی دەشتا
بەناو جەرگی، باکەی وەشتا
ئەسپێکی رەش،... مانگێکی سوور
شـــاری نازدارم.... وا لـــە دوور
لە کۆشکەکانی ... شارەوە
لە بەرزی و... لە تەلارەوە
مەرگە لێم مۆرِ ئەبێتەوە
رێگەم ... هەر نابرِێتەوە

[٦] ئەمە نموونەیەکە لە هۆنراوەکانی {لۆرکا} ی بویژی شەهیدی ئیسپانیا

ئای ئەسپەکەم چەند ئازایە
چەند بێ ترسە، چەند خێرایە

بەڵام ئاخ {قورتوبە}ی شیرین
مردن وا تاو ئەدا بە تین
پێش ئەوەی بگەمە ناو شار
ئەگاتە سەرم بە هاوار
(قورتوبە) دوورە، تەنیایە
ئەڵێ ی، لەو پەڕی، دنیایە

# ئەستێرە

لە ئاسمانی ژینا، بەیان
ئەستێرەی گەشم ئەپروان
ئەستێرەی سوور وەکو پشکۆ
ئەمرِشتە ناو گەرووی ئاسۆ
پەنجەم لە ئاگری رووتا
لەو پریشکەدا، ئەسووتا
تەزووی ژانێکی پێ ئەدام
گەرم، ئێجگار خۆش و بەتام
ئەڵێن: (رووناکیت ئەرِشتە)
ئەم وڵاتەی وەك بەهەشتە
کەچی خۆت شوێنت تەنگ و مات
ژاکاوە، گوڵاڵەی هیوات
ئەڵێم: (کێ ئەستێرەی باران)؟
هەوڵی ئەدا بۆ نیشتمان ؟
من: ( ئەوەندەم بەسە شادی)
بەرهەمی جوانی ئازادی

# باخەکەم

شیعرەکانم چەپکێ وشەن
تیا نی یە سەیر یا دەگمەن
بەڵام دڵی پەرۆشی من
بۆ دێڕێ شیعر دارِشتن
ئەگەڕێ نزارەو نزار
دەشت و چەم و باخ و گوڵزار
تا لە نزیك تاڤگە ئاوا
لە شەپۆلی خۆرەتاوا
ئەبێ بە دڵۆپێك ئاورنگ
ئەچێتە ناو دەریای گزنگ
لەسەر کەناری کەلی شین
ئەنۆشێ هۆنراوەی شیرین
یا ئەبێ بە شەوبۆ، بە گوڵ
ئەچێتە ناو کۆشی چقڵ
تا سروەی شەماڵی نیان
بۆی بڵێ نەغمەی شیعری جوان
لە قەترەی فرمێسکی چاوا
لەناو جۆگەلەی خوێناوا
لەم شوێنانەدا دڵەکەم
دێنێت شیعرە بە کوڵەکەم
باخێ ئاو ئەدەم بە خوێناو
کەچی خۆم نایبینم بەچاو.

مەچەك كەلـەپچەی بەزان بەجاریێ
ئەگەرچی خوێنی پیا دێتە خواریێ

ئەوی رەنج ئەدا رسواو بیێ نانە
كێش تالآن كەرە، ئەو خانەدانە
خاوەن ماڵ ئەمڕۆ برسی و بیێ ماڵـە
دز خاوەن ماڵ و خاوەن سامانە

چەند سەربەرزیە لـەرِیێ ی میللـەتا
لـەژێر سێبەری قەنارە و پەتا
(چریكەت) زۆردار بێنێتە لـەرزین
بیێ بەسروودی ولآتی خوێنین

هەرچەندە چنگی جەزرەبەی دوژمن
بگاتە جەرگ و گیربێ لە گەردن
ناتوانێ خوێنی باوەڕ بڕێژێ
کارناکاتە (بیر) ئاگر و ئاسن
تا لاشە لەسەر لاشە کۆمەڵ بێ
زووتر ئەگەینە لووتکەی سەرکەوتن

ڕەنگە دڵداری نرخی هەرزان بێ
بزەی گەرم و گوڕ، نەختێ گریان بێ
بەڵام ئەو عەشقەی گەل پەرستی یە
نرخی ئەبێ خوێن، خۆ بە کوشت دان بێ.

## کچەکەی خۆی

گزنگ، لە گەرووی کەژا
وەك ئاڵتوونی خاو، رژا
کەژاوی (1) ، ساردی بە گوڕ
رژایە، مەشخەڵی چڕ
پەردەی تەنك، ئاوریشمین
بە شەماڵ، کەوتە لەرین
لە نوێنا تلایەوە....
تا گڕی کوژایەوە....
کچی هەژاری بێ نان
بەجێ ی هێشت تەلاری جوان
دوای ئەوەی گوڵی... گەنجی
لەناو، نوێنێکا وەری
لە شەوا.... دوای پانزەساڵ
کچێکی جوانی چاوکاڵ
نیگا، تا بڵێ ی شیرین
قژی زەردی ئاگرین
هەر ئەو کوڕە، ئەو دڵە
ئەو دەروونە بە کوڵە

ئەو شەیتانە، دەسدارە
ئەو راوچی، پارە دارە
کچی گەیانە تەلار
ناو ژووری بریسکە دار
عروسی ئاوێنە بەن
ئینجا کوڕی دەوڵەمەن
بەرگی شیتاڵ کرد، لەپڕ
ماچی ئەکرد... گەرمو گوڕ
لە سنگی شیرینەوە
چاوی ئاگرینەوە
گڕ هەڵئەسا، بۆ، تاسەی
گەرم ئەبوو، هەناسەی
بەسەری برد، شەوی سوور
بەبێ شەرمی، بێ، ... سنوور
بەڵام ئەی پرشنگی کاڵ
ئاگات لێ بێ لە قەد پاڵ
کچی خۆی بوو... نەیزانی
هی دۆستەکەی جارانی!

بەڵێ سامانت زۆرە دەوڵەمەن
شتی جوانیشت نایاب و دەگمەن
بەڵام بۆ چیمن من ئەو سامانەی
نەیبەخشم بەگەڵ بۆ خاکی وەتەن
ئەو هەژارانەم خۆش ئەوێ کە گیان
ئەکەن بە قوربان خاکی نیشتمان

کەوتومە ڕێگا لەگەڵ کاروانا
پاداشتم ناوێ لە تێکۆشانا
تا دڵ لێ بدا و خوێنم تیا مابێ
بۆ کورد ژیانم هەر ئەبێ وابێ
بە سووتانم ڕێگە ڕۆشن بێ
با ئاگر بەشی ئەم لەشەی من بێ

ئەی کورد گیانی خۆم لەلا شیرینە
وا ئەیدەم بە تۆ، نەڵێ ی بەخشینە
چونکە هی خۆتە، کوا گیانی منە
تۆ نەبی ژینی ئێمە مردنە
( با ئەم لەشەی من بێت بە خۆڵەمێش)
( گلێنەی دوژمن بهێنێتە ئێش)

وتیان ئەو رێیەی کە تۆی لەسەری
مانای ئەوەیە بەلاوی ئەمری
منیش پێم وتن، ئەم رێ یە نەگرم
بە گەردن کەچی و کەساسی ئەمرم

تاریکایی شەو هەرگیز بێ گومان
ناتوانێ تیشکی چرایەك ون کا
رەهێڵە و تۆفی پایز و زستان
چەمێ ناتوانێ تا سەر لیخن کا

بولبول ژیانی ئەکا بە قوربان
نمێ شەونمی خونچەیەکی جوان
پەروانەی عاشق لە دەوری چرا
گڕ ئەخوا تا گڕ لە خۆی بەرئەدا
ئەی من بۆ نەبم بە قوربانی کورد
بۆ ئازادیی گەل خۆم نەکەم بە پرد

هەرکەسێ خاوەن زێڕ و سامانە
لە ئاسمانەوە بۆی نە باریوە
یا خۆی بە دزی کۆی کردۆتەوە
یا باوکی پارەی بۆ ئەو دزیوە

# بۆ شاژنە جوانەکە

شا ژنە شۆخ و شەنگەکە
دڵدارە جوانە مەنگەکە
مەلی پەڕ و باڵ هەڵوەریو
ئەی خەمگین ئاوات بەزیو
ئەی وەك پرشنگی خۆرەتاو
پەرچەمی زەرد و نەرم و خاو
چاوی گەش، لێوی تەڕ، گۆنا
یا رەنگی کاڵ، لە گەردنا
نمونەی جوانین، گەش و جوان
بۆ سیس بن، کزبن، بە گریان؟
نامەکەت گەیشت، تەڕ و بڕ
بە هەناسەی گەرمی، وەك گڕ
وشکم کردەوە، ئەی دڵدار
خوێنمەوە، هەنسکو، جە خار
لە هێلانەی عەشقی دڵا
کە تاسەی گەرمم نەکوڵا
نەمدی زیاتر لە وێنەی تۆ
روومەتی گەش، چاو و برۆ
پەردەیەکی زەردی ماتەم
هەر وەکو توێژاڵێك لە تەم
کشابوو، بەسەر، رووی گەشا
نا ئومێدی.. لە باوەشا

من تۆم خۆش ئەوێ ئەی پەری
بەڵام ئاخ ژنی جوان مەگری
باڵای تۆ گەردنی نەرم
سەرنجی ورد، تاسەی گەرم
لار و لەنجەت، زەردەخەنە
لەرینی ئەو ژێر گەردنە
جوانن، بەڵام ئاخ ژنی لاو
لە پاش چی!! ئەی ئەگریجە خاو
تازە بویت، بە مەلی قەفەس
بۆچیمە نامە... ئیتر بەس
نامەوێ من تۆ لەو کوڕە
داگیر کەم، دڵی زۆر پڕ
لە خۆشەویستی تۆی شیرین
لە دڵسۆزی – ئەی نازەنین –
ئەی گوڵی باخی بێگانە
بەسە ئەم ئاخ و گریانە
نامەوێ لەمەو دوا هەرگیز
بگریم وەك هەورەکەی پاییز

نرکەی راپەڕین دڵی بزوانم
گڕی ئازادی جەرگی سووتانم
هەر بەو دەنگەوە ملی ڕێ ئەگرم
یا ئازاد ئەبم یا لەڕێ ئەمرم
ئاگری عەشقی ئازادیی خاکە
گڕی بەردایە ئەم دڵە پاکە

ئەگەر چێ شەماڵ نەرم و نیانە
پەڕەی گوڵاڵەش هەڵ ئەوەرێنێ
چاوی تۆش گەرچی ئارامی گیانە
بەڵام پرشنگی دڵ ئەسوتێنێ

# یەکەم ئەرخەوان

وەکو کێوێکی ئـــــاگریـــن
ئارامی گەل هاتە لـەرزین
هەزاران چاو ئەشکی تێزا
دڵ بە پشتی خەما چزا
ئەستێرەکان ورد ئەوەرین
بۆ ناو قەترەی ئەشکی خوێنین
سۆزی دەنگ گڕی ئەنایە
دڵێك نەوتی تۆڵەی تیایە
شەپۆلی مەچەکی ئاسن
ئەینوسیێ: نا، نابێ بمرن
ئەبێ بژین
بژین وەك کێوی ئاگرین
منالْ لە باوەشی ساما
لەگەڵ هەستی بێ ئاراما
لە باخی ژیانی زەردا
لە ناو تەم و مژ و گەردا
ئەگریا وەکو فریشتە
ئەیووت: بۆچی ئەم بەهەشتە

بەم جۆرە ئاوا گڕ ئەگرێ
بابە پێم بڵێ: کێ ئەمرێ
لە دڵا هیوای سەرکەوتن
ئەینوسی: نا، نابێ بمرن
ئەبێ بژین
بژین وەك کێوی ئاگرین
شمشێرێ هەواڵی خەمگین
دای لە سلێمانیی شیرین
شەقامەکان باوەشیان کرد
بەوانەدا رۆڵەن بۆ کورد
لەو رۆژەوە گردی سەیوان
دیویێتی یەکەم ئەرخەوان
بەم جۆرە نەجۆشاوە شار
نەیدیوە کاتی وا خەمبار
کاتێ شەو بار و کۆچی خست
گیانی چوار لاو کەوتە سەرمست
چوار قەنارەی رەش رێك خرا
چوار پەت ئەڵقەی گرێ درا

شەپۆلی مەچەکی ئاسن
ئەینووسی: نا، نابێ بمرن
ئەبێ بژین
بژین وەك کێوی ئاگرین
هەموو دەنگێ برِایەوە
لە دەریای ژینا توایەوە
سروەی نیانی بای شەماڵ
دەنگی پڕ لە سۆزی منداڵ
نەغمەی تریفەی گەرم و خۆش
هاژەی پێکەنینی بە جۆش
کام دەنگ پڕێتی لە تەزوو
دەنگی ئۆخەی پڕ ئارەزوو
بوون بە سروودی پەلامار
بۆ سەر قەڵای رەشی زۆردار
دەنگی هەزاران و هی من
ئەینرکان: نا، نابێ بمرن
ئەبێ بژین
بژین وەك کێوی ئاگرین
هەموو رەنگێ کوژایەوە
لەبەر چاوم برِایەوە

ڕەنگی پیرۆزەیی سامانڵ
هی گوڵە زەردی نەختێ کاڵ
یا چیمەنی تەڕ و پاراو
قەڵبەزی وەکو زیوی خاو
ڕەنگی قەترەی گەشی شەونم
گورزەی جوانی گوڵە گەنم
بوون بە ڕەنگی سور بە تەنیا
یەکسەر سوور هەڵگەڕا دنیا
ڕەنگی ئاڵی تۆڵە سەندن
ئەینووسی: نا، نابێ بمرن
ئەبێ بژین
بژین وەك کێوی ئاگرین
کاتێ ڕەنگ ڕێژەکەی سروشت
خۆڵەمێشی ئاسمانی ڕشت
دڵی ناو پۆستاڵی دوژمن
چوار لاوی برد بەرەو مردن
چوار لەشیان داینەوە بێ گیان
بوون بە مەشخەڵی تێکۆشان
لە هەر چوار پارچەکەی وڵات
گەش هەڵگیرسا گڕی خەبات

دەنگێك گەیشتە نیشتمان

دەنگی دوا وتەی کۆڵ نەدان

بانگی کرد: وا ئێمە ئەمرین

تا ئێوە بە شادی بژین

دوا وتە: (بژی کوردستان)

بژی کورد، بژی کوردستان

بە خوێنی نۆزدەی حوزەیران

نوسیم چوار لاوی قارەمان

قورسی و خۆشناو کاکە عزەت

خیرالله مردن بۆ میللەت

# چرا

دڵداری من، ئەی کچۆڵەی شۆخ و شەنگ
چرایەك بوو، رووناك، لە ژوور سەرینت
تیشکی گەشی، کە ئەیدا لە شەوەزەنگ
کامەرانی ی ئەڕشتە باخی ژینت

کە چی لە پڕ دەس و پەنجەی نەفامیت
بە گوڕ ماڵی بە چرادا، بلووریا
بە خۆڕایی کەوتیتە دوای ناکامیت
بۆیە بەکوڵ فریشتەی دڵت گریا

تاکو ئێستەش لە شەوی خەمگینی یا
سەر لێ شێواو خەمبار، لە پەل کوتانای
لە ناو گۆمی لێڵی پەشیمانی یا
کۆست کەوتوانە هەمیشە لە گریانای

زۆر جار ژیانم تاریك دا ئەهات
ئاگر بەر ئەبوو لە باخی ئاوات
پێم لە ناو خوێنا، زنجیری ئاسن
پیا ئەڕشت تەزووی بەتینی مردن
سام هەر نەیتوانی پێ بەر پێ بنێ
بە کێوی وورەی دڵما هەڵزنێ

دڵ بە ئاورنگی پاکی دڵداری
وەك گوڵاڵەی ئاڵ ئەگەشێتەوە
بە زێڕ پەرستن چڵی نازداری
بەرەو جەرگی خاك ئەچەمێتەوە
دڵی باوەڕی قوربانی تیا بێ
جێی زێر پەرستی تیا نابێتەوە

# گریانی خۆش

کاتێ زەردەپەڕی شیرین
ئەتوایەوە ناو گۆمی شین
پەری زادەی دڵی گەشم
(خوای جوانیم)... هاتە باوەشم
لە پەرچەمی.. خۆرەتاوی
لە دەست و پەنجەی خەناوی
لە شەپۆلی نیگای نەرم
لە دەمی پڕ تاسەی گەرم
ئیلهامی دڵداری و جوانیم
بەستەی خۆشی و کامەرانیم
ئەمژی و لەناو دەروونی مەنگ
ئەبوو بە گۆرانی و ئاهەنگ
هەموو چرۆکانی دەروون
بوون بە گوڵی زەرد وەك ئاڵتون
کاتێ قرچەی هەتاوی سوور
ئەیهێنامەوە لە رێی دوور
گوڵی دڵداریم هەڵوەری
کە دیم نازەنینم ئەگری

تلك تلك دڵۆپی ئەسرینم
ڕژا لە چاوی خەمگینم
یار و ، تەلاریك و گریان
دڵداری و ناسۆری ژیان
دوای دوو- سێ ساڵی تەماوی
شەوی مات و گریاناوی
کچێکم دی نیگاری جوان
وەك، نازەنین، پەریی ئاسمان
ئەو، ڕووە، ئەو دەمە گەشە
ئەو، چاوە، ئەو، برۆ ڕەشە
هەر وەك نەخشی ڕووی نازەنین
ورد و ناسك، جوان و شیرین
دیسان گریام، نەختێ بە کوڵ
ڕام چەنانەوە، پەری دڵ
دوای حەوت ساڵی ئازاراوی
شەوی ماتەم و خەماوی
چوومە سەر تەرمی یارەکەم
بووکی ناکام، دڵدارەکەم

دامه، تاوی، هەنسك، بە گوورِ
ئەگریام وەك منالّ بە خوورِ
تیّر تیّر گریام، لەسەر تەرمی
شینیّکم گیّرِا بە گەرمی
ئۆخەی کە دلّم تیّر گریا
بەکولّ، بە جۆش، بە ئاشکرا
ئەی فرمیّسکی دلّی بیّ هۆش
بۆم بگیّرِە، گریانی خۆش!

# من ڕەشم[٧]

من ڕەشم وەکو کینیا
ئەمرم لەڕێ ی ئازادیا
وەکو ڕەنگی شەوێکی ڕەش
یا وڵاتی منی بێ بەش!
وەك جەرگی ئەفەریقاکەم
نیشتمانە بێ ناوەکەم
ڕەنگم ڕەشە، پێستم ڕەشە
ئەم دەنگە هی قولەڕەشە:
جاران کۆیلەیەك بووم هەژار
بەر دەرگانەی کۆشکی زۆردار
ماڵی {قیصر}م، ئەماڵی
ژینم بەسەر برد بە تاڵی
من بووم (بۆ یاخچی) دوور وەتەن
قۆندەرەکانی واشنتەن
لە کۆشما بوو، هەر منیش بووم
بە هێزی دەماری بازووم

[٧] ئەم هەڵبەستە هی بوێژی ئەمەریکی {ماك کریا} یە

به عەرەقم، بە خوێنی گیان
بنچینەی کۆشکم هەڵ ئەسان
(هەرەم) بناغەی من دامنا
بەردم ئەدا، بەسەر شانما
قوربانیەك بووم لە (کۆنغۆ)
بەلـچیکیێکان بێ (شەرموشۆ)
دەستیان، قرتانم، لە بنا
دەست رۆشتون، لە کوشتنا
ئێستەش لەناو (کینیا) کەما
لە دارستان و ناو چەما
گوللە بارانم ئەکەن هەر
منی رەش، منی دەربەدەر
بە خرکە بەردی (تەکساسیان)
کەوتوونە (دووم) بە بەرد باران
زۆر، رووبارم دیوە بە خوورِ
لە هاژە هاژا، تاوی گوورِ
(نیلی) بزورگی دڵنیا
لە ناو قووڵی بێ دەنگیا
سەرنجی داوم، زۆر بە دڵ
جار جار بۆ من هاتۆتە کوڵ

ئاوی (مسیسبی)شم دیوه
که جار جار پێم پیَ کەنیوه
یان به دڵ بۆ من گریاوه
به گوورِ لافاوی هەستاوه
وەکو رووی ئەو رووبارانه
لۆچ لۆچ و پیر بوو ئەم گیانه
برام من ئینسانم، ئینسان
وەکو ئێوه دەمار و گیان
من ئازادیم ئەویَ هەرگیز
بۆی بەخته گیانی (قول) بەرِیز
من رەشم وەکو کینیا
ئەمرم لەریَ ی ئازادیا

چاوی لە من کرد خونچەی بە سزمان
یەخەی دادڕی سەر تا بە دامان
مۆم و پەروانەش من فێرم کردن
ئەسرین ڕشتن و گڕ لە خۆ بەردان

لای ئێمە بەرزی هەر بە سامانە
نە بوونی سووکی و نزمی و تاوانە
کێ دەوڵەمەند بوو ئەڵێن بوو بە پیاو
وەکو پیاو نەبن ئەم هەژارانە

ئەسرینی هەژار ناکەم بە یاقووت
یا سۆزی گریان مۆسیقام نابێ
ژین لەسەر ئەرکی برسی و ڕەش و ڕووت
یا چەوسانەوە من هیوام نابێ

# ئەستێرە و مەل و خەزان

ئەو گوڵەی خەزان وەرانی و نەمرد
ئەو دڵەی، ناسۆر، لە هیوای نەکرد
ئەو پریشکانەی، دامردنەوە
بەڵام هەمیسان، گڕیان گرتەوە
ئەو ئەستێرەیەی کشا بۆ ناوچەم
لە سەرە مەرگا، خەندەی لەسەر دەم
ئەو مەلەی، بای وەشت، باڵی هەڵوەران
لە بەستە وتن، نەکەوت لە ئاسمان
وان لەناو دڵی، منا میوانن
چونکە نموونەی (قەت) کۆڵ نەدانن

# تینوومە!

ئەمڕۆ تینوومە...........

زۆرم تینووە، هەر وەك بیابان

لمی سوتاوم، تاسەی تاساوم"

تینوون، بۆ نەختێك دڵۆپی باران

سادەی هەورەكەی ژیان، بارانێ

رامالێت پووشی نائومێدی دڵ

- خەندە و گریانێ-

شۆڕشی لێشاو

با هەستێ بە تاو

بۆ سەر قەلاكەی سەختی دەروونی"

سزاو نەبوونی....

دەرهێنێ لە بێخ ژاڵەی پەژارە.

ژیانم تاڵە

ئەمڕۆ تینوومە هەر وەك بیابان

نامەویٚ هەرگیز من دەوڵەمەند بم
وەکو ئەوانە رسواو بە پەند بم
چونکە بە تەنیا رەنجی هەژارە
ئەبیٚ بە زێڕ و سامان و پارە

هەژار با ژینت هەر تێکۆشان بیٚ
بۆ گەل گیانی خۆت لەلا هەرزان بیٚ
هەوڵت بۆ کورد و بۆ کوردستان بیٚ
( گەر لە کیست چیٚ بەم تێکۆشانە)
( تەنیا نەبوونی و کۆتی گرانە)

## هێلانەی ئارام

قژی خاو، قژی زەردی کاڵ
گەردنی ناسك، کوڵمی ئاڵ
چاو، هێلانەی ئارامی دڵ
پەنجەی ناسك، دەسی وەك گوڵ
لار و لەنجەی ورد و نەرم
بزە و سەرنجێکی گەرم
بۆچی ون بوون، بوون بە خەیاڵ
خەیاڵیش نەیما پەڕ و باڵ!!
ئەی پەری ئاسمانی رماو
چی بکەم، لەگەڵ زێڕی گڵاو
تۆی فڕان، بۆ کۆشکی سامان
ناتگاتێ، نە ئاخ، نە گریان
ناچارم ئەوەبێ پیشەم
داوێنی جوانی بەر نەدەم
دڵم خۆش کەم بەوەی کە من
شەیدام، بۆ روومەت و گەردن
ئەی گوڵاڵەی بە خەم تەزیو
چاوی کەژاڵی کل نەدیو
با بڕێژێت فرمێسکی زۆر
وەك نمی ئاورنگی بەر خۆر

ئەی مەلی قەفەسی زێڕین
ئەی باڵا بەرزی خوێن شیرین
من دڵسۆزی و تۆ یاری دوور
هی رابوردوویەك، زەرد و سوور
بابڕێژین تك تك لە گیان
خوای دڵداری بێتە گریان
ئەی زێڕی زەردی سارد و سڕ
چۆنت برد دڵی گەرم و گوڕ
ئەی ئاوازژەنە مەستەکەم
سۆزێك بۆ دڵە پەستەکەم
تا ژین وابێ دڵداریە
کوشتەی دەسی زۆر داریە
تۆ رۆشتی خوات لەگەڵ ئازیز
دڵت وەکو گوڵی.... پایز
هەڵیوەران، خەزانی خەم
چاوی هیوامان گرتی تەم
تۆ نەمردووی، ئاخ دڵت مرد
زێڕ ئابڕووی، دڵداری برد

لە گەرووی شەوا، لە کوردستانا
هەزاران مۆمم داگیرسانەوە..
تۆ لە پێناوی زێڕ و سامانا
مۆمی هەژارت زۆر کوژانەوە
بۆیە دڵی تۆ شادیی نەدیوە
بەڵام من خۆشی دڵمی تەنیوە

بستێکم نەدی لەم خاکە جوانە
خوێناوی کوردی پیا نەڕژا بێ
یا چیایەکی ئەم کوردستانە
هەزاران مێشکی تیا نەپژابێ
بۆیە بە تەنیا هەر دڵۆپێ خوێن
بۆ شیعرەکانم ئەکەم بە هەوێن

وشەی (نان) گەرچی جیاوازە دەنگی
بەڵام لای هەموو هەژارێك نانە
برسی جیاواز بێ رەگەز یا رەنگی
شێوەی رووی تەنیا هەڵبزرکانە

رەزبەر وەرانی گوڵی رەنگاورەنگ
بۆیە تەرمەکەی شێخ مەحمووی نەمر
دڵی بێ پەروای لاو و کیژی شەنگ
بوون بە ئیکلیلی وەك گوڵی ئاگر
شاگوڵی باخچە بۆ ئەم رەزبەرە
گیانی پیرۆزی پاکی (ئەختەر)ە

بە پەیژەی هەورا بچم بۆ ئاسمان
مانگ و ئەستێرە بۆ کورد داگرم
وەك شاخی سەختی گمۆ بە سنگم
وروژمی گوللەی دوژمن راگرم
هێشتا هەر دڵم ئاو ناخواتەوە
تا (ئاواتی کورد) رۆژ نەکاتەوە

ئەوی هەر پارەی لا نرخدارە
چاوەڕێی بەری ڕەنجی هەژارە
گومانی نی یە هەرچی بە نرخە
لـەم ژیانەدا ئەیدا بە پارە

بۆ تۆ ئاڵتوون و تەلار و سامان
بۆ منیش ڕێگەی سەختی تێکۆشان
تۆ بۆ خۆت ئەژیت، بۆ خۆشت ئەمری
من بۆ گەلی کورد، خاکی کوردستان

## زەردەخەنە

لە ناو باخی دڵی گەرما
لە ئاسۆی دەروونی نەرما
بووی بە فریشتەی نازەنین
گوڵاڵە سوورەی گەش، شیرین
لە کۆشکی خەیاڵما هەرگیز
ئاوات بووی، ئەی کچی ئازیز
لە ئاسمانی یادما بە شەو
ئەبووی بە تریفەی مانگەشەو
لەگەڵ شەماڵی، پێ دەشتا
یا، بای بزێو لەگەڵ وەشتا
دڵی من ئەفڕی دۆڵاو دۆڵ
ئەیبڕی شەخەڵ، دەشتی چۆڵ
بۆ ناو باخی دڵداری گەش
تا ئارام بگرێتە باوەش
هەنسکی چاوە نوارێمت
رازی وردی دڵداریمت
کرد، بە، بەستە، بە ئاوازە
بە نەغمەی شیرین و تازە

لانکەت لەدڵما دانابوو
کەچی لە پڕ، ڕۆژانی زوو
ئاوا بەسەر چوو وەکو خەو
ڕۆژی دڵداریت کرد بەشەو
دەك شەرمەزاربی، شۆخوشەنگ
لەپڕ، لە ناکاو، بەبێ دەنگ
گوڵی هیوام، کاتێ وەری
لە جیاتی ئەوەی، بۆی بگری
لەسەر رووی، ئەو گوڵە نەرمە
کردت، بە ئاهەنگ، بە نەغمە
شەرمەزاربی، هی دڵت، دڵ
ڕۆژانی، ڕابوردووی بە کوڵ
بەڵێنی جاران..... کە نیشکە
دەك هەر خەم بۆت بێ، بەبێشکە
ئەرێ بۆ وازت لێ هێنام؟!
ئەی کچی جوان، کچی نەفام؟
تەلار؟، یا پارە؟ بڵێم زەڕ؟
زڕەی گوێچکەی تۆ بکا کەڕ

ناو؟... کام ناو؟! هی دەوڵەمەندی
بەڵێ، بەمانەوە...... بەندی
نەمناسیوی! ! ببوورە لێم
لۆمەت ناکەم، رووت لێ نانێم
ببوورە! نەمزانی سامان
بۆتە هیوای تۆ.... کچی جوان
ناوت نایەنم.... تۆ وەك گوڵ
ئەوەرێیتە ناو خاك و گڵ
ناگریم...! تۆ بگری، بەسزمان
پەنا بەرە، بەر ئەشك و ژان
ئەوسا لەسەر پارەی مردوو
بگری، خۆزگەت بە رابردوو
بلێ خۆزگەم بەو دڵەی زوو
بەو ژیانەی لە کیسم چوو
زەردەخەنەکەت، بێ گومان
ئەرژێتە ناو خوری گریان
ئەتوێتەوە، ناو ئەشکی سوور
نام بینیت مەگەر هەر لە دوور
نایبیستی نەغمەی رازەکەم
بەستەی شیرین، ئاوازەکەم

بڕۆ بۆ ژووری ئاوێنە
وەك تیمسالێك خۆت بنوێنە
تیمسالی مەڕمەڕی بێ گیان
ئەی (قوربانی)ی ساردی ژیان
منیش وەك پەپوولەی پایز
ئەگەڕیم بۆ خونچەی ئازیز
بۆ دڵێك، من، نەوەك ئاڵتوون
بگرێتە دڵ، ناخی دەروون!

لە ژاڵەم پرسی تامت بۆ تاڵە؟
وتی: براکەم فڕانی" مردن
وتم: ئەی ڕەنگت بۆ گەش و ئاڵە؟
وتی: لەبەر دۆست، لە داخی دوژمن

کام شوێن دڵگیرە لە دەشت و چیا
دڵم بە بێ باك وەك مەل تیا ژیا
تا بانگی بەرزی ڕزگاریی وڵات
ڕایکێشامە ناو کاروانی خەبات
ئێستە ئەزانم ژین ئەبێ وابێ
تەنیا (خەباتە) کە نرخی تیابێ

بولبول بوو، ڕەنجی لەگەڵ گوڵ کێشا
کەچی بای بەیان عەتری گوڵی برد
بە پەنجەی عەشق بێستوون کە نەخشا
کەچی فەرهاد بوو ناوبانگی دەرکرد

لە (فارسی)یەوە

دایە تۆ منت بۆ پەروەردە کرد
بۆ خۆشیی خۆت بوو یا نەتەوەی کورد؟
وا من بۆ گەلم خۆم ئەدەم بە کوشت
خوای ئەکرد دەریای فرمێسکت ئەڕشت

چاو ئەبڕێتە ڕەنجی هەژارێ
من لە تاو هەژار چاوم لێك نانێم
بۆیە چیت هەیە سامان بە جارێ
نرخی پووشێکی من بۆ دانانێم

ئەم کوردستانە لەت لەت کراوە
دوژمن پێ لەقەی لە جەرگی داوە
ڕزگاری نابێ تا نەوەی کاوە
خوێن نەکاتە سەر خوێنی ڕژاوە

## وشەی {دایە}

تریفەی مانگ رژایە ناو،
ئەو چاوانەی پڕ لە ورشەن
وەك کانی بەهاری پاراو
بوون بە شیرینترین دیمەن

وتی لە مانگ و خەرمانەی
جوانتر هەیە، کاتێ سروشت
ئەو هەموو تریفەی جوانەی
ئەکاتە باخەوە بە مشت

وتم: لەو چاوانەتایە
دوا سەلیقەی هونەری جوان
نە مانگ ئەو جوانی یەی تیایە
نە ئەستێرەی بەری بەیان

بەڵام کاتێ کە کۆرپەکەم
وشەی دایەی لە دەم هەڵات
چرپانی خۆشەویستەکەم
گوێت لێ بێ لە نەغمەی ئاوات

کە باوەشی پیاکرد ووتی:
هەر تۆی دیمەنی جوانت بێ
بە وشەی رەوان و پەتی:
( دەك دایە بە قوربانت بێ)

ئەوی ئەم نانە دێنێتە بەرهەم
هەمیشە برسی و رووت و هەژارە
بەلاّم دەولّەمەند بە جەورووستەم
بوو بەخاوەنی سامان و پارە
وا دیارە ئەمڕۆ یاسای ژین وایە
هەرکەس رەنج بدا رەنجی بە بایە

دیاریی دەرسیمت کاسەیەك خوێنە
چەپکە ئەگریجەی دایکی بەسزمان
تا رزگار نەبیّ ئەو خاك و شوێنە
قەت ئۆقرە ناگریّ دلّی کوردستان

## دیاری

گریانی زۆر، هەناسەی سارد، ئەشکی خورِ
خورپەی بزێو، نا ئومێدی کوتو پڕ
لالآنەوەی دڵی هەژار، هەناسە
خەمی دەروون، تینی ئاگری تاسە
ئەمانەیە و، لـەمان، قولـتر، کە هەستیّ
وەکو گڕێك، لە دەروون، یان لـە هەستیّ
دیاری دڵدار، بۆ یارە نازدارەکەی
یا رازی گیان، هی گیانە بێزارەکەی
بەڵام وا من، کچی شۆخ، ئەی جوان و مەنگ
دیاریی خۆمت، بۆ ئەنێریم، رەنگاورەنگ
نە ئازارە، نە فرمێسکی دڵ و چاو
نە سوێی برین، نە هەڵڕشتنی زووخاو
دیارێکەی من، وردە، شیرین و تازە
گەرم و گوڕ، وەك شەپۆلی ئاوازە
نەختێ ورشەی ئێوارانی، خۆرەتاو
بەسەر پەردەی گولێکی ئالا، پژاو
ئەو پرشنگە وەکو ورشەی نیگای کاڵ
لـەسەر، رووی تۆ... روومەتێك ناسك و ئاڵ
لـەو کانی یەی رەنگی بەشەو، وەك زیوە
دلۆپ، دلۆپ، لـەو شەپۆلـەی تەزیوە

وەك شەونمی ئەو دوو لێوە... ناسکە
کە پڕیەتی لە تاسەو، لە ترووسکە
هەروا نەختێك، لە زەردە خەنەی شیرین
هی دەمی گەش، یان کەلی ئاسمانی شین
لەم دیاریانە لای من، کە رەنگین تر بێ
یا لەمانە، جوانتر، نازەنین تر بێ
بەڵێنێکە، کە شێوازەی ژیانی
من و تۆیە،... هۆنیمەوە بە جوانی
سەرنجی وورد، قوڵپی ئەو ژێر گەردنە
بە ژنێکی رێك.... ئەو چەناگە خڕپنە
چپەی نەرمت، لەرەی دەنگت لە گەروو
دڵیان پڕ کرد... لە تاسە و لە ئارەزوو
ئاوازەیەك... یان، لەرەیەك لە دەنگێ
یا ورشەیەك، لە گۆنای شۆخوشەنگێ
تەلی هەستیان وەك تۆ نەلەرزانووە
پەریی عەشقیان، لەخەو هەڵنەسانووە

# پەنجەی ژیان

لە ژوورێکی رەنگاو رەنگا
لە گۆشەیەکی بێ دەنگا
شەرمی پیرێتی کۆچی کرد
بۆ سنگی سپی، دەستی برد
پرچی رژایە سەر مەمك
سەر سنگێکی گەرم و ناسك
باڵی لە کەمەری ئاڵان
ماچی تەڕ پەنجەی ئەلەرزان
وەکو شەیتانی شەیدای روو
دەمی لە روومەتی ئەسوو
بە گەردنیا، ئەهات تاسەر
بە ماچ، هی روومەت، دەمی تەڕ
ئەینوارِیە، رەسمێکی جوان
وردە کاری پەنجەی ژیان
نوێنی بۆ کرد بە چوارچێوە
شەوگاری لەگەڵ برِیوە
گوڵی ئاواتی هەڵوەران
بەچی؟! بە پارەی نەختێ نان!

کچی منالّی جوان... قژ زەرد
کچی نەشمیلانەی.... بیّ گەردا!
لە تەلاری ئاوێنە بەن
تا نەختیّ کردی بە شیوەن
رۆیشت...!!! بە زەلیلی بیّ سرەوت
پیرەش،!! رووی کردە ناو مزگەوت
وەکو جاران نوێژی دابەست
پشتێنێکی رەنگ زەردی بەست
کچو کورێك بە گوزەرا
هاتن، جلی جوان لەبەرا
دوو فریشتەی دڵداری بوون
نەختیّ بۆ گەشتی باخ ئەچوون
پیر، تفی کردەوە، ئینجا
وتی: {ئایا حەیا هەڵگیرا}

جگەر گۆشەکەت بنێیتە ژێر پێت تا ئەیتاسێنی
ریشەی بەزەیی بە چنگی تاوان لە بێخ دەربێنی
ناگاتە ئەوەی رێگەی رسوایی خیانەت بگری
تۆڵەی خوێنی کورد بە خوێن لە هێزی دوژمن نەسێنی

سێ کەس بەم شێوە و جۆرە ئەناسین:

١–هێمن لەکاتی تووڕەبوون و قین

٢–دلێر ئەو کاتەی خەزانی گیانە

٣–دۆستی دڵسۆزیش.. کاتی تەنگانە

(لوقمان)

# گۆرانی من

با هێلانەکەم، هەر، تەنگ بێ
ئاوازەکەم، بێ، دەنگ بێ
وەرزم، پایزی زەرد بێ
لێ نیشتووی گوڵم گەرد بێ
ئەگەر بڵێم کوردم... من
یەکسەر زمانم ببڕن
پێوەندەکەی جاران بێ
ئەڵقەی رەش و گران بێ
ئاوا هەژار و لات بم
ئاوارەی ناو وڵات بم
لێوی خەفەت لێ نیشتووم
یا رووی ژاکاوی زەردبووم
وەك گەڵای زەرد، دیاری بێ
مووچەم، هەر دارکاری بێ
رێگەم بەداو، تەنراو بێ
دڵم کپ و گوشراو بێ

{شەرت بێ پڕ گەرووی هەستم}
{ئەم جارەش هەر بۆی هەستم}
بەستەیەك بڵێم ئێجگار
گەرم و خۆش بێت بۆ هەژار
( بۆ ژینی کوردەواری)
بیکەم بە نەغمەی دیاری
دەروونە پڕ نەغمەکەم
سادەی بەستە گەرمەکەم

## جوانی بەهار

توێژاڵی بەفری خەمگینی سەر کەل
ئەرژێتە ناو چەم، وەکو پەڕی مەل
وێنەی بێ هێزی جێ ماو لەکاروان
لە خاڵ خاڵ ئەرژێت، شەپۆلی گریان
کە دێن لەسەردا بۆ کۆڕی مردن
گورجن، لە ترسی هۆزاری جرپن
بەفر ئەرژێتە گۆڕستانی شاخ
ناوێرێ هەرگیز بکا ئاخ و داخ
ئاوی قەڵبەزەی سپی رەنگاورەنگ
لە گەرووی کەژا، ئەیکا بە ئاهەنگ
وەختێ کە تاڤگە دێتە پێکەنین
مەلانی بزێو دێنە هەڵپەڕین
بووکی بەهاری جوانی رازاوە
لە کوردستانا خەیمەی هەڵداوە
ورشەی پەڕەی گوڵ، وەك ورشەی نیگا
بولبولی عاشق بۆی ئەبێ شەیدا
لەسەر لوتکەی شاخ تاجی زەردە پەڕ
پرشنگ ئەهاوێ بۆ ناو ئاوی کەڕ
لەسەر کەناری چەمی پڕ نەغمە
ئەو خونچە سوورەی ناسك و نەرمە

بەرگی داماڵی سەوزی ئاودامان
خۆی شت بە قەترەی بەفراوی کوێستان
وردە شەپۆلی جۆگەلەی بلاو
ختوکەی بەردە لە کەناری ئاو
گوڵ کاسەی بادە، شەونم بۆتە مەی
مەل مەست و سەرخۆش، دەمی پڕ ئۆخەی
وەکو فریشتەی گوڵی هەڵوەریو
لەسەر سنگی ئاو، جۆگەی وەکو زیو
ئەڕۆن بەرەو خوار، بە پشتە مەلە
ئەپژێتە دەمیان تیشکی ئەو کەلە
گەڵای پان ئەکا بە جۆلانە: مەل
گوژمە گوژمێتی لەم پەل بۆ ئەو پەل
یا گەڵا مێوێك ئەکا بە لانکە
شەونم لەسەر گوڵ وەکو ملوانکە
تە پا و تل، لە پڕ، بەردێك بۆ ناو دۆڵ
دێتە خوارەوە تا ئەبێت بە خۆڵ
وەك ئەویش شەیدای گوڵێك بێ وەك لێو
ئارەزومەند بێ بۆ باخی نشێو
شەخەڵ هەر جارە جۆرە رەنگێکە
ئاوازی گەرووی چەشنە دەنگێکە

لە هەر جوڵەیەك، دەنگێك، ئاوازێ
لە هەر ورشەیەك: یا ڕاز یا نازێ
چەند جوانە گوڵی قەیفە بۆ سوخمە
نێرگسی نازدار بکەی بە دوگمە
لە تەم دەسماڵی سپی زۆر تەنك
شەوبۆ، پوولەکەی جوان، دەنك دەنك
کیژۆڵەی نازدار ئەم دەشتو چەمە
لار و لەنجەی تۆ، بزەی تۆی کەمە
ورشەی کراست کە بێ لەم دەشتە
ئەوسا کە ئەڵێم باخی بەهەشتە!
ئێوارە وەختە زەردە پەڕی ئاڵ
زەماوەندی خۆش دێنێتە خەیاڵ
کە شەو دێت ئاسمان ئەستێرەی جوانی
بە مشت ئەکاتە ناو دەمی کانی
گوڵ، پرشنگ، جۆگە، وەنەوشەی نازدار
هەموو دڵدارن بۆ ژینی بەهار
ئەستێرە دەمی نایە سەر گۆنا
تك تك ئارەقی ئاورنگی... رژا
لە تاڵ تاڵی گوڵ تەلی کەمانە
شەماڵ شمشاڵی ناو ئەو چەمانە
بەڵام ئاخ دڕکە ئەم ساتو وەختە
لە ناو بەهارا تیژ و خۆش بەختە

جوانی ی داگیرکرد به یەك پاروو نان
گولاڵەی گەشی شانازیی وەران
بۆی کرد به زنجیر قەفی پرچی جوان
بۆ شەوێك گیانی (کچێنی) مران
کەچی پێ ی ئەڵێ: ئەم داوێن پیسە
بۆ کۆمەڵ بۆتە (لەکەی) رووی ژیان

هەزاران مانگی تریفە زیوین
لە دلّی منا ئەدرەوشێنەوە
گوڵ به ملیۆنان هی سوور و زێڕین
لە باخی دڵما ئەگەشێنەوە
رووناکی لە ناو دڵێکا ئەبێ
هەژاران تیایا نەچەوسێنەوە

## پشکۆی هۆنراوه

بۆ هۆنراوەی جوان و رازاوه و بەتام
چیای سەخت و پیّ دەشت و گوڵزار گەرِام
لە گزنگ و زەردەپەرِ و هاژەی چەم
لە نیگای گەش، زەردە خەنەو بزەی دەم
لە ئەستێرەی پیرۆزەیی و لە ورشەی
لە گوڵاڵەی ئاورنگ چێژ و لە پرشەی
زۆر هۆنراوەم چنی ناز دار و ناسك
بۆ دڵخوازی شیرینم بە دەسك
بەڵام دەنگی کرِوزانەوەی کۆرپە
کاتیّ رشتی لە دڵما ژیلەی خورپە
سۆزی گریەی ئەو دایکەی لە ئاگرا
جەرگی وەکو چراووگیّ هەڵکرا
لە هێزی خست دەست و پەنجەی هۆنراوەم
کەوتە ناو گرِ، چەپکەی شیعری رازاوەم
ئێستەش هەرچی پیّ ی بڵێن شیعری تازە
جوان و پاراو، تیا بیّ ورشە و ئاوازە
هۆنراوەیەك پێی بڵێن بیّ هاوتایە
لە دڵی من هەڵناقوڵیّ و دەرنایە
باخی شیعرم شپرزەی خوێن و ئەشکە
کانی ی بەهرەم وەکو گەرووی خۆم وشکە

لایلایەکەی خەوی خۆش بە کۆرپە بـین
نەغمەی خۆش و دڵ بزوێنی بوو بە شین
بەستەی خۆش و تەڕ و بڕی دڵخوازی
بۆ بووکی گڕ، ژیان کردی بە جیازی
هۆنراوەی ورد کامی خۆش و بەتامە
کە دڵ بەسۆز، نایە سەر نووکی خامە
دێڕ دێڕ سزا، قەترەی خەمی پیا تکان
بەسەر دڵی پەروەردەی خەما لکان
تۆش داوات کرد شیعرێ بڵێم ڕەنگاوڕەنگ
وەکو بەژنی کچێکی جوان شۆخ و شەنگ
باسی چاو بێ، هی دەمی ئاڵ و گەردن
قژی زەرد و کولمی ناسك و خڕپن
بەڵام ئەبێ لەمەودوا وەك ئەم ژینە
کە هەمووی خوێن، کڵپە و گڕی بەتینە
شیعری منیش بە تەنیا ڕەنگی سوور بێ
لە دڵداری و بەستەی ناسك بە دوور بێ
تازە ڕابوورد ئەو سەردەمەی هۆنراوەم
باسی جوانیی باڵا بوو، کولم و پەرچەم
هەر چیم هەیە، لە ئۆقرەی دڵ، لە تاسە
هەمووم بەخشی بەو منالە کەساسە

ئەبێ شیعرم لە گڕا پەروەردە بێ
باسی (ژین)ی سامناکی ئەم کوردە بێ
ئەی فریشتەی هۆنراوەی ئاگرینم
ئەی بەخشندەی وشەی بە سۆز و تینم
ملم لارت، ئەپاڕێمەوە لە تۆ
پێم ببەخشی هۆنراوەیەك وەك پشکۆ
هەر ئەم جارە و ئیتر داوام کۆتایە
هەر چەند ئەکەم شیعری سوورم بۆ نایە

# جارانم

جارانم دڵم بە مەئیوسی
دێری خەفەتی ئەنووسی
تەرمی زەوقم سست ئەگەڕا
کڵپەی پەژارەم ئەگڕا
جاران هەستم تەماوی بوو
هەرچیم ئەوت خەماوی بوو
لە دەشتی ناسۆریما هەر
ئەگەڕام: وێڵ و دەربەدەر
ئەموت ئاخ، بۆ شارەزایە
زامی سارێژ بکردایە
نە گوڵ، بەو رەنگە جوانەوە
نە چڵ بەو چرۆیانەوە
نە مۆسیقای شەماڵ، هاوین
نە هاژەی ئاوی کەف زیوین
نە جریوەی مەلی سەرچڵ
نە غەمزەی کچی، روومەت گوڵ

ساڕێژیان نەکرد زامی من
برینی جەرگێکی کون کون
تا پەنجەی تۆ، پەنجەی نەرم
ساڕێژی کرد، زامی گەرم
تۆ ئەڵێم: خوای خۆشەویستی
کە سەرچاوەی شادی و هەستی
ئەی (خۆشەویستی) نیشتمان
تۆ بووی منت کرد شادمان
ئەی گیانەکەم کە تۆم ناسی
ئیتر نەژیام بە کەساسی

## فریشته

روومەتی وەك گوڵی بێ گەرد

قژی خاو، ئاوریشمێکی زەرد

چاوی کاڵ، ئەگەرچی نەرمە

بەڵام نیگای ئێجگار گەرمە

باڵای وا، دەمێکی وا تەنگ

ئەندامی ئاوا شۆخ و شەنگ

نەبووە... یا من نەمدیوە هەر

لەو چەشنە بەژن، یا کەمەر

لەو رەنگە کوڵمی گەش و ئاڵ

لاملێکی وا جوان و کاڵ

جوانێکە تاك، وەك فریشتە

ئاخ وەسفی من، زۆر درشتە

کوا شیعرێك ورد، خۆش و گەرم

وەك ئەندامی لەشی... نەرم

کە شین ئەپۆشێ وەك ساماڵ

وەك مانگە، لە ئاسۆی خەیاڵ

من هەر ئەوەندەم لە دەس دێ

کە دێت وەك کەو، تێ پەڕ ئەبێ

پێشکەشی کەم، یەك هەناسە

پڕ لە پەرستن، لە تـــاســـە

نەمزانی ئەوی دڵسۆزی خاك بێ
ڕەوشتی بەرز و کردەوەی چاك بێ
ئەبێ ژیانی هەر زەبوونی بێ
تا ماوە بەشی هەر نە بوونی بێ

زۆر کەس ئەبینم کە پارە دارن
بێ کەڵك و نەزان، وە یا زۆردارن
بەڵام ئەوانەی کە خاوەن بە هرەن
زوربەیان ڕۆڵەی برسی و هەژارن

ئەو کاتە خۆشەی ئـــاگر بارانە
لـــەژێـــر پێمانـــا دیلی ئەنێژین
لە سەر بستێکی ئەم کوردستانە
بێ پەروا خوێنی دوژمن ئەڕێژن
لە لوتکەی کەژا، ئاڵا هەڵ ئەگرم
بەڵێن بێ ئـــــەبێ پێوە بمـــرم

خاکی کوردستان فەرشی رەنگینە
بەڵام ئەوەندە پێ ی لێ نراوە
ئەم هەموو نەخشە وردە شیرینە
بە پێ لێنانی دوژمن پواوە
رەنگی نوێ ی تەنیا ئەبێ خوێناو بێ
تاڵی چنینیش برژانگی چاو بێ

دوو دڵۆپ خوێنی گەش لە رووی تکا
ملیۆنان خونچەی هیوای پێ پشکوت
رۆژێ دێ لەگەڵ گوڵی ناسکا
چاوی گەش ئەڕوێ نەك هەر گوڵی رووت
برژانگی چاوی کچی نەغەدە
پەرژینی باخی ئاواتی کوردە

تا سەندنی حەق زیاتر گران بێ
خوێنی دڵسۆزان ئەبێ هەرزان بێ
تا پێوەن زیاتر ژەنگ هەڵ بهێنێ
(بەند) بە خرۆشتر ڕا ئەپەڕێنێ
تا زۆردار زەبر بنوێنێ پتر
زووتر لە گیانی بەر ئەبێ ئاگر

## بەفر

بەفر وەکــو فــریشتــەی بووك
دێتە خوارێ، ورد، ئێسك سووك
تەلاری بووکێنی.... ئـاسمان
جێ دێڵێ بەرەو باخی جوان
مراوی، لە ترسی ســەهۆڵ
بەجێ دێڵێ جۆگەلەی دۆڵ
لە دوور، قاسپەی کەوی تەنیا
زریکــەی مــەلی نـــاو چیا
(( ئەی کلووی بەفرە جوانەکە))
((وەرە، بۆ، بەر، هەیوانەکـــە))
بە تیشکی چرا و مانگە شەو
زەردبە، وەکو گــەردنی ئەو
خۆزگە لەم ژوورە تەنگەدا
لــەم گەنجینە بێ دەنگـــەدا
لە تەکما، ئەبوو، نازەنـــین
بزەی نازدار، نیگای شیرین

زیڕەی ســـەماوەرێکـی زەرد
بریسکەی ڕوومەتی بێ گەرد
منالێکم هەبوایە..... گوڵ
چۆنە.... ئاوا بوایە بۆ دڵ
ڕووم ئەکردە ژنی نازدار
ئێوارە وەختەی پرشنگدار
ئەموت گۆشتەکە، دەمەو بانگ
دانێ لـەبەر تـــریفـــەی مـــانگ:
(( ئەی بەفری پڕ لـە شنەشن
جارێ مەیە.. سەرمامە مـن))

## وێنە

ئەی چەپکە تیشك و دەسکە گوڵ
وێنـــەکـــەتـــم نـــایە سـەر دڵ
زامی دڵی تـەنگ و زەبوون
بە وێنە ناکا گۆشتە و زوون
(( گرەی یاد)) زامی کۆن و نوێ
هـــەمیشـــە دێنێتـــەوە ســـوێ
بێ بـــەلا بی هـــۆشت بـردم
کلپەی خـەمت خۆشتر کردم
تیری هەزار و یەك تاسە
پێکای ئەم دڵە کەساسە
بۆچی بۆت نـــاردم فریشتەم
وێنەی دووری پەژارە و خەم
لەســـەد لاوە دڵـــت سمیم
من بەم دەردەوە چۆن بژیم؟!

# پیانۆ

لە تیشکی کوڵم و گــەردنی
بریسکەی خونچەی ئاڵی دەم
هۆنـراوەی جـوانم بۆ چـنی
بۆم پێچا بــە تــاڵی پـەرچەم
*      *      *

لە سەر پیانۆی خەندەی بە کوڵ
بــە پــەنجەی ئاگرینی کــام
بــۆ کۆرپەلــەی ئــارامی دڵ
ئــاوازم لێ ئــەدا بــە تــام
*      *      *

ئەستێرەم ئــەدا لە قژی
مانگم کرد بە تاس کڵاو
تریفەی سنگیم ئــەمژی
بە لێوی هەستی پڕ گوڵاو
*      *      *

بــە شنــەی نیـانی شەمــاڵ
کــاتێ پــرچیم ئەکرد شانە
هەستم بۆ شەوقی کوڵمی ئاڵ
یـەکسەر ئەبوو بە پــەروانــە
*      *      *

شەرمی ئەڕشتە سەر ڕوومەت
چاوی بەنازی لێك ئـەنــا
تــەزووی دڵداریی بەلـەزەت
بــەنــاو دڵما هــەڵ ئـەزنا

*　　*　　*

بــەڵام ژینم وەك شەوێ بێ
لە نــاكــاوا بــڕایــەوە
ئەو خۆشیەم وەك خەوێ بێ
لە ئــەشكی چاوا توایـەوە

*　　*　　*

جــریـوەی مەلێ بوو نەمــا
یا شەقــەی بــاڵی هۆزارێ
تیشكێ بوو ون بـوو لە تەما:
( شۆخێ، ناسكێ، نازدارێ)

گوڵ بەو جوانی یە لە کۆشی دڕکا
ئەگـــــەشێتەوە پـــەڕەی ڕەنگینی
دڵ بۆ شاد یگـــای بی یەوێ بڕ کا
ئـــــەبـــێ بـــــچێژێ تاڵاوی ژینی
(هیوا) ش لە کۆشی ناسۆر و خەما
ئەپشکوێ خونچەی جوان و شیرینی

باوەڕ ئەی زۆرداری خوێن ڕێژ
دەروونم، دڵـــی ســـزا چێژ
بـــەهێز ترن لە پەت، ئاسن
بۆیـــــە سڵ ناکەم لە مردن
ئەی مـــل کەچانی ترسنۆك
وەك ئێوە نایەمە سەر چۆك

# ڕەهێڵە

لەسەر کوڵمی ناسك... (مردن)
دەسی کـــرد، بـــە بەستە وتن
پەرچەمی تـــەڕ، ئـــاڵا لە مـــل
فرمێسکی ئەڕژا، لەگەڵ.... کل
شار پەرۆشی، ڕەهێڵەی سەخت
( ڕێی گرتە بەر لەگەڵ ناوەخت )
پرچی تەڕی پـەرش و شیرین
بەستەیەکی ئەوت خـــەمگین
با... ئەیدا لە پرچی سەرشان
ئەلـەرزی وەك تەلی کـەمـــان
ئەندامی لەش، گەردن، نـــاو دەم
شۆڕ شۆڕ لیێ ی ئەڕژا ئاو و خەم
باران، ئەچوو بە گژ... گردا
لافاو لەنـاو قـــەدی پـــردا
زریکو هوڕ چرای ڕەنگین
ئەگریان بەتاو... ئەلـەرزین
ژنی بـەژن و بـــاڵا نازدار
ئەپێچایەوە... جادەی شار

ئەینوارِیە رێی گــۆڕستان
چاوی ژاکاو پڕ لـە گریان
پووزی ناسك، کەمەری تەنگ
بە تکی قوڕاو رەنگــاو رەنگ
کپ و خەمگین و مات: کۆڵان
لـە پڕ، هەورێك" ئەیزریکان!!
کارەکەری... جوان، وەکو گوڵ
بە دەم گریانــەوە، بـــە کــوڵ
وتی! کوڕی کۆشك و تەلار
لاوی بـیٚ رەحمـــی پــارەدار
دەسی بڕیــم و دوای ئــەنجام
وەختێك کە گەیشت بە مەرام
خۆی و دایکی دەریان کــردم
ویڵ ویڵ... بەم دەردەیان بردم
بیٚ لانە، بیٚ کــەس، بیٚ هـــاودەم
ئەی خوای هەورو باران چی بکەم؟
پەریی کچێنیمیان.... مران
بوم بە ژن.... منی بەسزمان

ئەی کۆرپەی (باوك تاوان بار)
لــە ئێستەوە بگـــری بـــە زار
هەژارێك فریای کەوت... قەشەنگ
وتی: ئــەی ژنی شــۆخ و شـــەنگ
تۆزی ئاڵتوون نە نیشتووە
لــەم دڵـــــە پڕ ئـــارەزووە
هـــا، دڵـــم هێـــلانـــەی تـــۆ بێ
جێ ی، ئەو رووە، جوانەی تۆ بێ

*　　　*　　　*

# ورشەی داس

ئەی هاوڕێیانی قوتابیم
من لە دەروونتانا ئەژیم
لە ئاگری گۆرانیا
لە نرکەی کامەرانیا
لە ورشەی ئەستێرەی گەشا
لە ناو قەیتانێکی رەشا
لە تیشکی مانگی (ئەمەلا)
لە جریوەی خۆشی مەلا
ئەی هاوڕێیانی قوتابیم
هەرگیزاو هەرگیز من ئەژیم
کاتێ ئەم لە شەیان کوشتم
خوێنی ئەم دڵەیان رشتم
لەگەڵ دووکەڵ و ئاگرا
کشام بەرەو ئاسمان برا
ئێستە، لە ئەستێرەیەکام
گوێم لێ یە پێم ئەڵێن: کوژرام
گوێم لێ یە لە ورشەی داسا
لە هۆرەی خالۆ هەباسا

دەنگی سروودی سەرکەوتن
را ئەمالَیٚ قەلاَی دوژمن
جووتیار: بۆ خۆتانە (شارا)
چرای خۆشیتان هەلَکرا
خەلەتان زەردە وەك ئالَتوون
ئەی برای جووتیار چاوتان روون
بۆ خۆتان ئەکەن شەن، درەو
ئاگری رۆژ، سووتانی شەو
وتم: زۆرداری و خوێنمژی
چەوسانەوە، نابیٚ بژی
بۆیە درامە بەر تفەنگ
تاکو پشکۆی گەشاوەی دەنگ
بنێنە ناو ئاوی مردن
لایان وایە بە خوێن رشتن
لە شکری (بەیان) ئەبەزیٚ
چنگی هەقی گەل ئەتەزیٚ
ئەی خاوەنی زەوی و زاری
میراتی هێزی زۆرداری
باوکە (چاو شینەکەتان) مرد
ملی کەچ ناکا گەلی کورد

(رژێمی جمهوری) رەگی
خوێنمژینی دەرەبــەگی
لـــەبن دەرهــێـــناوە لـــە بن
خاوەن ماڵ تەنیا جووتیارن
ئەم خاکە ئەم زەوی و زارە
پشتاوپشت ماڵی جووتیارە
ئەی هاوڕێیانی تێکۆشان
خەفەت و ( قوتیلە) و گریان
کسپەی زامی کۆنی بەسوێ
بنێنە ناو تابووتی نوێ
ئەی پاڵە و هاوڕێی قوتابیم
( هەمزەی حەسەن) ئەڵێ ئەژیم
هاوڕێینە بۆ من مەگرین
بڵێن: (هەر بژی نەبەزین )

# دوا شیعر

قژت لادە لەسەر کوڵمی پشکۆی ئاگر
لەسەر سنگ و لاملی وەك کلووی بەفر
لەگەڵ تۆمە ئەی دوا تیشکی خۆرەتاو و
دوا پریشکی دڵی دامرکاوم!
لەگەڵ تۆمە دوا دێڕی عەشقی ژیانم
دوا هەنسك و دوا قەترەی ئەشکی گریانم
تاکەی ئەنوارِیتە لێڵی گۆمی چاوم
رووی بەخەفەت و پەژارە هەڵقرچاوم
ئەو وشەیەی لەناو دڵتا قەتیس ماوە
بیدرکێنە، نە، ئاگرە و نە لافاوە!
ئەم دڵ لێدانەی شاعیر مەرەنجێنە
بەو وشەیە دڵی شیعرم بجوڵێنە
تەنیا جارێ پێم بڵێ من تۆم خۆش ئەوێ
بەڵکو ئەم دڵە گڕۆزەم پێ ی بسرەوێ

١٩٨٦

# ئەی شارەکەم سلێمانی

خونچەی بزەی لێوی ساوا
لە دڵۆپی ئەشکی چاوا
لە بێخی دڵی ناسکا
توایەوە وەکو خوێن تکا
لەسەر سنگی کچۆڵە و ژن
بەخوێن نووسرا: ئەمان کوژن
کۆرپە بەدایکا هەڵزنا
خەم بە دڵی وەك ئاسنا
بەیان کاتی خۆرهەڵاتن
هەڵی کرد رەشەبای مردن
بەخرمەی شەست تیری دۆشکا
گەلێ دڵ وەك شووشە شکا
سلێمانی... شاری خەم چێژ
راهاتووی کوشتار و دەست رێژ
سلێمانی یەکەی بەرگەگر
یەکسەر هەمووی بوو بە ئاگر
تانك، زرێ پۆش، تۆپی مەزن
بانگیان ئەکرد: ئەبێ بمرن

دوژمنی ئابڕوو تکاو
بڕبڕەی مەردێتی شکاو
لەناو شارا بەبێ وچان
تۆوی ترس و مەرگی ئەچان
پشکۆی سام و خەم و سزا
بە پەنجەی ژینا ئەچزا
ماچی خوێناوی دایك و کوڕ
لە شەقاما ئەبوو بە گڕ
سوپای ساواو بێ چەك کوشتن
قەدەغەی کرد تەرم ناشتن
لاشەی کوڕ لە کۆشی دایکا
پێڵووی سووری پیا ئەلکا
رۆڵەکانی کورد بانگیان کرد
ئەژی ئەو کەسەی ئەمرۆ مرد
کاتێ ئەڕۆن بەرەو سەیوان
بانگ کەن: کوردستان یان نەمان
بەقوربانتان بم بزەی دەم
نەوەکو سام و ترس و خەم
با فوارەی خوێناوی گەش
باخی کورد بگرێتە باوەش

دایك لەگەڵ نەغمەی هەنسك
رای ئەوەشان دەس و باسك
ئەیوت: ئەی جگەری پارەم
ئەبی بەگوڵ ئەم بەهارەم
ئەشكت بۆ ئەكەم بە ئاورنگ
گڕەی دڵیشم بە گزنگ
سلێمانی... شاری دڵتەنگ
بانگی لێ هەڵسا بە یەك دەنگ
وتی: دوژمنی ترسنۆك
رۆڵەی كورد نایەتە سەرچۆك
دوژمنانی ئاوات و رەنج
بانگیان ئەكرد: ئەی كوڕی گەنج
یا بە دەست رێژێك ئەتكوژین
یا بڵێ پێشمەرگە نەژین
بڵێ من كورد نیم... كوردستان
ئەكەم بە گۆڕی مەبەستان
وێران بێ، كاول بێ خاكم
من كویلەیەكی دڵ پاكم
ولاتم، چیم هەیە دەگمەن
با پێشكەش بێ بە ئەهریمەن

کیژۆڵەی چاو کەژاڵی جوان
هەموو بن بە کەنیزەکتان
نا.. هەزار جار بانگ ئەکەم: نا
دوژمن نیم بەخاکەکەم ، نا
بانگ ئەکەم بە وشەی پەتی
بژی، بژی کوردایەتی
ها.. ئەوە رووم، دڵم، سنگم
ئەوە بازووم، ئەوە چنگم
پێشکەش بێ بە گوللەی دوژمن
مل کەچ کردن نازانم من
من کوردم، ئاگری هەستم
گڕ ئەستێنێ بۆ مەبەستم
نابم بە کویلەی بێگانە
کەنیزەك نین ئەو کیژانە
لەسەر مشتێ خۆڵی وڵات
بێ پەروا گیان ئەکەم خەڵات
نا، هەزار جار بانگ ئەکەم: نا
دوژمن نیم بەخاکەکەم، نا
دوژمنانی خەبات و رەنج
بانگیان ئەکرد: ئەی کوڕی گەنج!

بانگ کە بلّێ: بمرێ منالّ
هەلّوەرێ گولّی باخی ئالّ
دارزێ پەنجەی هونەروەر
دەك بشکێ ئەژنۆی کوردپەروەر
وێران بێ خاکی شارەکەم
بێ بەپایز بەهارەکەم
نا، هەزارجار بانگ ئەکەم: نا
دوژمن نیم بەخاکەکەم، نا
لەپێناوی ساوای کوردا
لەرێگەی درشت و وردا
لەسەر گولاّلّەی خوێن رەنگم
جۆگەی خوڕو گۆمی مەنگم
بەردێکی کەژی ولاّتم
لەسەر ئامانج و ئاواتم
دلّم، ژیانم ئەبەخشم
بابێ بە بلّێسە لەشم
لەلای ئێمە سزا و مردن
پیرۆزە نەك ملکەچ کردن
ئەبم بە قوربانی گولّێ
چاوێ، دەمێ، دەستێ، دلّێ

لەم خاکە بێ و هی ئەم خاکە
گیانم لە مردن بێ باکە
چاڵێکیان هەڵکەند فراوان
قووڵ وەکو دەروونی تاوان
هەشتا لاوی کوردیان ریز کرد
لە دڵ بەهێزەکانی کورد
ریزیان کردن وەك چراوك
براو هاورێی و کوڕو باوك
درانە بەر شێلگەی تفەنگ
نرانە خاکەوە بێ دەنگ
خوڵیان پیا کردن سەرانسەر
تەخت کران بە گرێدەر
پێش مردن هەموویان وتیان:
ئەمرین بەبێ باك بۆ ژیان
برایان! چمکی خەم مەگرن
ئێمە ئەمرین، ئێوە خۆش بن
ئەی شاری سلێمانی جوان
ماڵئاوا لە تۆ و کوردستان
نا، هەزار جار بانگیان کرد: نا
دوژمن نیم بەرامبەر کورد، نا

لە پێڵوما ژیان نووسی:
نابێ بژین بە مەئیووسی
وەرن لەسەر دڵ بنوسین
کەمال و ئەنوەر و یاسین
لەگەڵ کاروانی شەهیدان
بوون بە قوربانی کوردستان
ئەژین لە لاپەڕەی ئاڵا
لە گوڵاو لەگەڵ شەماڵا
لە مەرگی سەختی دوژمنا
لە نرکەی هەڵمەت بردنا
نا، هەزار جار بانگ ئەکەم: نا
دوژمن نیم، بەخاکەکەم، نا

رۆژنامەی برایی ١٩٦٨

## ئاگری رووت

ئەی پێشەوا.....
یادت لە دڵما نارِوا
بیرو باوەڕی گەشی تۆ
وەکو دەریای گڕ و پشکۆ
رژایە سەر سەهۆڵی ژین
بەفری پەروا و ترس و بەزین
رایماڵی کەژی دواکەوتن
دارستانی سامی مردن
دڵی وەك تۆپەڵە بەفر
بەنرکەی تۆ بوو بەئاگر
نەتەوەی کوردت ڕاچەنی
بۆ ڕزگار بوونی وەتەنی
بەپەنجەی بیری ئاگریت
لەسەر دڵی کورد پەروەریت
رێ و شوێنی خەباتت نەخشان
بۆ رزگاربوونی کوردستان
(مەهاباد) (شنۆ) (نەغەدە)
کام شوێن جەرگی گەلی کوردە

کۆتی گرانی ڕاتەکان
کەلەپچەی مەچەکی پسان
ئاڵای کورد لە دڵ و چاوا
لە کەژا جۆگەی خوێناوا
بۆ ئەم گەلەی هی تۆ و منە
وردە وردە کەوتە شنە
کۆتری وشەی خۆش و جوان
دڵی جێ هێشت بەرەو ئاسمان
زمانی زکماکی بزووت
بۆ سروودی ئاگری رووت
ئەی پێشەوا....
پەردەی شەوی دیلی پووا
لە دڵی کوردا نیشتمان پەروەریت وەشان
تۆوی کورد پەروەریت وەشان
بەڵام نەتدی ڕیزە شارا
لە تیشکی خۆر بکا تارا
ناتە گەردنت ئەڵقەی پەت
مردی بۆ ئازادی میللەت
ئەی پێشەوای ئێمە قازی
تۆ بۆ کورد بووی بەشانازی

بووی بە مەشخەڵی تێکۆشان
بۆ کورد بۆ خاکی کوردستان
ئەی پێشەوا.....
یادت لە دڵمانا ڕووا
کاتێ پەتت خستە گەردن
گفتوگۆت بوو لەگەڵ مردن
هەر دڵ بوو هەر چاو بوو تك تك
تیێ ی ئەزا هەشی قەترەی ئەشك
کرێوەی ترس و خوێن ڕشتن
چاوهەڵکۆڵین و پیاو کوشتن
ئەم کوردستانەی گرتە کۆش
وەرانی چرۆی ژینی خۆش
بەڵام دڵانی بێ پەروا
هەر نەبەزین ئەی پێشەوا
لەسەر قەنارە نرکانت
بۆ ئازادی کوردستانت
بانگت کرد نامرێ گەلی کورد
گەشە گوڵی ئەمەلی کورد
وشەکانت کاتێ لە گیان
باریە ناو دەشتی ژیان

لەگەڵ پرشنگی خۆرەتاو
قەترەی ئاڵی گەشی خوێناو
بەدەس و پەنجەی کوردپەروەر
کرا بە جوانترین پەیکەر
ناوی قازیمان لێ هەڵکەن
نامانە ناو جەرگی وەتەن
ئەی پێشەوا....
تۆی نموونەی گەشی برِوا
دوای کۆچی تۆ برای رەنجبەر
لاوی بێ پەروای تێکۆشەر
پێچاوی پشتێنی نەبەزین
بۆ هەڵمەت بۆ رۆژی خوێنین
کاڵەی هەوڵی لێ هەڵکێشا
خەتی سەرلەنوێوە کێشا
سوێندی خوارد بە تۆ و بەشێرزاد
بە خاکی شنۆ و مەهاباد
بە بۆکانی دڵ بریندار
بە فرمێسك و خوێنی هەژار

دەس هەڵنەگرێ تا کوردستان
رزگار ئەبێ ئەی قارەمان
ئەی ئاگری رووت پێشەوا
یادت وەك گوڵاڵە روا

١٩٦٠

# هۆرەی تازە

هۆرەی سەپان،
هۆرەی ئاگراوی سەپان
دەنگی بێ لەزەتی چەپەر
بولّە بۆلّی خاتوو گەوهەر
زرمەی دار، شریخەی تفەنگ
رژانە دڵ!
چاوم کاتێك کەهەڵهێنا
منداڵێك بووم رووت و هەژار
لە پارچەیەك خاما ژیام
ژیانێك، بڵێ بێ تام
وا ئاغات هات!
مناڵینە خێرا هەستن
جوان وەکو سەرباز راوەستن
چاوت لێ بێ سۆفی هۆمەر
دیسان دارەکەی راوەشان!
تۆ بڵێ ی تورە نەبووبێ؟
لەتۆ، لە جولاّنەوەی من

جوان راوەستن
هۆرەی سەپان
جریوەی باڵداری بەیان
دەنگێ بوو وەك دەنگی گریان
کۆڕە بچکۆلەکەی ئاغا
پۆشتە و پەرداخ
لەناو گژوگیا لە باخا
ئەهات و ئەچوو زۆر نەرم
وەکو باوکی نەرم نەرم
ئێمەش نەختێ تەزووی شەرم
ئەهات بەلەشمانا هەموو
بەڵێ فەرموو
لێوی جووڵەی بکردایە
بەجارێ ئەمان ووت: فەرموو
ئەو بوو خاوەنی زەوی و زار
خاوەنی من، هی دار و بەردیش، هی کۆڵان
سۆفی هۆمەری شفتە ژێ
هەموو شتێك هی ئاغا بوو
بەڵێ قوربان بەڵێ: فەرموو!

دەنگی بێ لـەزەتی چەپەر
قیڕەی تیژی خاتوو گەوهەر
تورِەبوونی ئاغا و سەرکار
ڕژانە دڵی بچووکم
هەر دەنگێ هەڵ ئەسا یەکسەر
تێ ی ئەگەیانم من سووکم
لەگەڵ تیشکی بەری بەیان
داسەکەم ئەخستە سەرشان
بووم بە لاوێ
بازووم لێ هەڵماڵی بۆ کار
بووم بە سەپان
بووم بە جووتیار
هەڵی دڕە جەرگی زەوی
بی دێرە بەڵکو نانی جۆ
هەرنانی جۆ، نەختێ کەرە
با چۆرِێ دۆ
بخۆی بێ دەنگ
کرِنووش بەرە
کرِنووش بۆ بەردەمی ئاغا
ئاغا بەخشندەی بێ هاوتا

بپارێزە وەك منالّ
بۆ نانی تالّ، بژی سەد سالّ
بەخەپلەی بیّ لەزەتی گالّ
دەمە و بەیان، تا زەردەپەڕ
هۆرەی بۆ نان
بۆ نانێکی جنێواوی
بۆ خەپلەیەکی خوێناوی
بەڵێ تا دەمی زەردەپەڕ
رەنجم ئەدا، رەنجێکی گەرمی بیّ وچان
وا مەلا هات
مەلای چاو باشقاڵی نەفام
ئامۆژگاری چەوت و بیّ تام
ئەبارێنیّ وەك خڕکە بەرد
ئەریّ مەلا چیت پیّ وتین!
کڕنووش بەرین!
بەڵێ ئەیوت: بژی سەد سالّ
بە خەپلەی گالّ
بۆ نانی بیّ لەزەتی گالّ
کڕنووش بۆ ئاغاتان بەرن
گەورە و بچووکی بفامن

دنیا پووچە سبەی ئەمرن
بەڵێ ئەمرن
دوای چەند ساڵێکی پڕ لە ژان
بووم بەپیاوێ
هەم بێ زنجێ، باوەشێ دار
نەختێ بەرهەم
بڵێم زەخیرەیە و ئەیخەم
راکە خەرمانەکەت سووتا
کێ؟ سووتانی
ئەی دوێنێ جنێوی نەدا
کێ؟
کوڕەکەت
لەپاش ملە ئەی وت ئاغا
بێ ویژانە
خەرمانەکەم،
خەرمانەکەم
ئەی ئاگری خەرمانەکەم
خەرمان
ئەی هۆی ژیانەکەم

لە دڵما بووی بە پشکۆی قین
تۆ بڵێ ی تۆڵە نەسێنین!
ئاغای زۆردار
ژیانی لێ شێواندبووم
براینە باوەڕ بکەن
منی جووتیار
هەمیشە نیوە مردوو بووم
تفی ئەکردە رووی پیرم
لەڕووی پیرم
بەم جۆرە تەمەنم گەیان
بە شەست ساڵی پڕ ئەرك و ژان
شەست ساڵێك ژیام بە درۆ
ئاغا بۆ تۆ، بەڵێ بۆ تۆ
ئاغا من ژیام بۆ تۆ
بەڵام ئەمڕۆ
ئاغا ئەمڕۆ
گوێت لێ بێ چی ئەڵێم بە تۆ
ئەو زەویە هینی منە
هی رەنجی شان

دەست بەری بۆ گوڵێ گەنم
لە خەلەی من
یەخەت ئەگرم
وا خەرمان ئەکەم مەڵۆ
ناژیم بۆ تۆ
لەمەودوا من ناژیم بۆ تۆ
هۆرەی سەپان
دەنگی شمشاڵی کاکەی شوان
قووقەی کەڵەشێری بەیان
چەند بەجۆشن
لەدڵی منا زۆر خۆشن
بۆڵە بۆڵی خاتوو گەوهەر
خاتوو گەوهەری ئاغا ژن
ناگاتە گوێم
لەمەودوا هەرگیزاو هەرگیز
نادا لەپەردەی هەستی من
ئەم زەوی یە بوو بەهی من
بمرێ دوژمن، بمرێ دوژمن

١٩٥٩

# توانەوەی بەفر

توایەوە، بـەفری بــەستەڵەك
ترپەی پێ دێ، هی ڕەشبەڵەك
لـەجاڕی نێرگسا، لـە دەشت
وەك پەری و فریشتەی بەهەشت
کچانی ئاڵ و واڵاپۆش
هەڵئەپەڕن، گەرم، بەجۆش
ڕمبازی شۆڕەسواری شەنگ
جۆش زیاتر ئەدا، بە ئاهەنگ
ئەم دیمەنە وردانە، جوان
تامێك ئەبەخشن بە ژیان
تامێك، یادێك، وەك شەماڵ
دێنێ و ئەیدا، لەڕووی خەیاڵ
بۆیە مەلی، دڵ، ئەفڕێ
ڕێ ی هەزاران ساڵ ئەبڕێ
تیری زەهراوی "ئەهریمەن"
ئەیسمێ سەردڵی وەتەن
ڕوومەتی قوتیلـەی کز
ئەلـەرزێ وەك گەڵای پایز

لەپڕ تیرێکی ئاگرین
ئەیدا، لە پەنجەرەی ڕەنگین
یا، دڵی، ئەسمێ، یا، روو
سنگی کۆرپەی خەولێکەوتوو
رووی کچ، کە دەرئەکەوت وەك گوڵ
تیێ ی ئەچەقی تیر، وەك چقڵ
هەموو ئاوازێکی بەجۆش
هەموو گۆرانی یەکی خۆش
ئەتوانەوە "یەك" ئاوازە
"نەغمەی تۆڵەو ژینی تازە"
"کاوە" کە هەڵی کرد، ئاڵا
گەل لە قەڵای زۆردار ئاڵا
ئەو چەکوشەی تاکو "ئەمڕۆ"
شانازی یە بۆ من و تۆ
لەسەری دوژمنا بوو
رزگاری بوو کوردی زیندوو
گۆرانی یەکی خۆش داهات
ئێستەش باوە لەنێو وڵات
ئەی شمشاڵی گەرووی هەستم
رێکی خە، لەگەڵ هەڵبەستم

سەرەتای ئەو گۆرانی یە
ئەمەیە: ( کەپڕ جوانی یە)
"ژین کە دیلی بێ سەر و مڕ
ئیتر بۆچی نەبین بە گڕ"
( تا خوێنمان نەرژێتە گڵ
هەرگیز ناگەشێتەوە گوڵ)
بەم تێکۆشانە گەلی کورد
ئاگرە گەشەکەی هەڵکرد
بەم ڕەنگە نەغمەی پڕ خرۆش
هەڵئەسا، لە دڵەوە، جۆش
ئەی هاورێ ی خۆشەویستی من
ئەی نەبەردی، مەچەك ئاسن
لام وایە، بەهار، بەتەنیا
جەژنی گوڵە، هۆزار، چیا

# بارزانی [٨]

رۆمانیا
بۆ ولاّتی رۆمانیا
شەقامی تاسەی دیداری
کۆشکی رۆڵەی کوردەواری
گەورەم کە نامەکەتان هات
نامەی ئاگرینی خەبات
تاڵی گزنگی زەرد و سوور
بوو بە تەلی وردی سەمتوور
شەونم وەکو دوگمەی پیانۆ
پەنجەی سووری تیشکی ئاسۆ
ورد ئەجولێنێ و، ئاوازە
هەڵئەسێ بۆ ژینی تازە
چوار ئەسپی ئاسن و ئاگر
چوار پەلیان سپی وەك بەفر
سوارەکانیان پارچەی دڵە
زینیان ئەرخەوان و گوڵە
بەتاو ملی رێگە ئەگرن
پێشڕەوی سوپای نەمرن

---

(٨) ئەم هۆنراوەیە لە شێوەی تەلەگرافدا رێکخراوە بەبۆنەی گەڕانەوەی تێکۆشەری بەناوبانگی کورد مستەفا بەرزانی یەوە وتراوە. (کامەران)

بەپیر ئێوەوە دێن هاوڕێ
گیانی پیرۆزتان قەت نامرێ
پیرەژنێکی بارزانی
کە ئەهات بۆ سلێمانی
بەئەسپایی لێم ئەپرسی:
مەلا مستەفا ئەناسی؟!
بڵێم، خۆت دیوتە گەورەی گەل
تیشکی رووناکی دەمی کەل
ئەیوت هەردوو کوڕەکەی من
براگیان هەر لەگەڵ ئەون
ئەموت خەم نەخۆیت شانازین
بوون بەنموونەی نەبەزین
داپیرەگیان قسەی من بوو
رۆژی خەفەت بەسەرچوو .
لە زیندانا کوڕێکی شەنگ
زۆرجار ئەمدی مات و بێ دەنگ
ئەنوارێتە بستێ ئاسمان
پێم ئەوت: ئەرێ کاکە گیان

لەچی دەر ئەدەی پەنجەی بیر
ئەینواڕیە کۆت و زنجیر
ئەیوت: چەن خۆشە چنگ گیرکەم
لە قورتمی دوژمنەکەم
هاوڕێینە ناوهێنانتان
دوژمن دای ئەنا بەتاوان
بەڵام هەرچیمان بەسەرهات
ئۆخەی، بوو بەخۆشی وڵات
گەورەم ئەی گەورەی لەشکری
ئاشتیخوازی و کورد پەروەری
بەهەواڵی رۆمانیا
دڵم لەخۆشیا گریا
هەموو ئازای لەشم لەرزی
وشە لەناو دەمما تەزی
گەورەم وا ملیۆنان کۆتر
جێیان هێشت باخی پڕ ئاگر
بەری ئاسمانیان رێك تەنی
بەپۆل هاتوون بۆ دیدەنی
ئەی وڵاتی رۆمانیا
وەکو هەوری لوتکەی چیا

گریانم لەخۆشیا کە هات
هەواڵی سەرکردەی خەبات
ئەوەندەی دڵۆپی ئەسرین
کە ئەیباران چاوی خەمگین
چاوی دایکی رۆڵە کوژراو
دایکی خەمباری سك سووتاو
سڵاو لە ئێوە و لەوانە
کە تیشکن بۆ ئەم ژیانە
کە بوون بە پێشڕەوی کاری
رزگاربوون لە چنگ زۆرداری
هاورێم هەزار هەزار سڵاو
لە ئێوە و لە لەشکری لاو

١٩٥٨

ئەگەرچی دڵی سەردەمی لاویم
بڵێسەی بەرزی کوردستانم بوو
بازووی بەهێز و چنگی خوێناویم
نیشانەی زەبری تێکۆشانم بوو
بەڵام پیریەکەم سوتێنەر ترە
چونکە نەك هەر دڵێ بوونم ئاگرە

ئاگری تەڕی هۆنراوەی خەیام
خوێناوی گەشی میوەی ڕەزان بوو
تاسە و ئارەزوو نۆشینی ئارام
لەلای ئەو کچی نەشمیلەی جوان بوو
بەڵام شیعری من خوێناوی خۆمە
بووکم دەروونی سووتاوی خۆمە

# نادیە[٩]

بۆ نادیە
کە ئاگری ئازادیە
بۆ ئەو کچەی کە نابەزێ
بۆیان دروست کرد قەفەزێ
قەفەز لە ڕم، لوولەی تفەنگ
نایانە ناوی وەك کۆتر
کچۆڵەی ژیلەمۆ و ئاگر
تا دەنگی گەرمی ئەو دڵە
دەنگێ کە هێجگار بە کوڵە
بکەن بە قوربانی داری
دەست و مەچەکی زۆرداری
فریشتەی نوتقی هەق وتن
لە بێخی دڵیا بکوژن
دڵێ بۆ ژیانی تازە
بۆتە سەرچاوەی ئاوازە
دڵێ کە کانگای باوەڕە
لەئاستی بەزینا کەڕە

---

[٩] نادیە کچە تێکۆشەری ئەردەنی

ئەی دەروونی من، نادیە
شمشاڵ ژەنی ئازادیە
سروەی شەماڵی دەنگی ئەو
نیوە مردوی هەستان لەخەو
گوڵی سیسی گەشانەوە
ئاڵای سووری شەکانەوە
بەڵام ئەو دەنگە بەجۆشە
سۆزی ئەو قریوە خۆشە
بۆ بارەگا و تەخت و بەختی
زۆردار، بۆ، زیندانی سەختی
لێشاوی ئاگری گەشە
شاڵاوی بڵێسەی خەشە
ئەی قارەمان ئەی نادیە
دەنگت نەغمەی ئازادیە
نادیە، لەجیاتی بازن
کە ڕات وەشان ئەڵقەی ئاسن
گڕی عەشقی خۆ بەکوشت دان
بەربوو لە دڵی نیشتمان
کە جووڵانت چاوی خەبات
ئاگرت بەردا لە وڵات

چمکی کراسی نەبەزین
ئەی کچی لاو، خوشکی شیرین
کاتێ کردت بەکەمەرا
بەرپات کرد شۆڕش و هەرا
لاوی مەچەك پۆلا وتی:
ئەوی ئەمرێ بۆ میللەتی
ئەبێ بە پەپوولەی دەشتی
نیشتمانی وەك بەهەشتی
لەسەر پەڕەی گوڵی یادی
شیرین و گەشی ئازادی
بەشی پرشنگ مژین ئەبێ
هەر رەمزی نەبەزین ئەبێ
ئەی کچی ئازا، نادیە
بەژنت ئاڵای ئازادیە
تۆ لە دڵی گەلای نازدار
بەڵام تەختی پاشای زۆردار
لەشوێنێکایە ئەو شوێنە
پشکۆی ئاگر، گۆمی خوێنە
گەل بە شەخەل دەوەنی قین
بە داخی دڵی ئاگرین

بە درکی هەق تەنیویەتی
وەکو تۆڕێك چنیویەتی
پاشا، لەکۆشی دوشمنا
لەناو قۆناغەی مردنا
بۆی ئەڵێن: گورگانە شەوێ
بەڵکو خەوی لێ بکەوێ
ئەی خەو لەچاوی شا تۆرێن
دڵمان بۆ تۆ کرا بەنوێن
بنوو دڵنیا، نادیە
دڵت پشکۆی ئازادیە
ملیۆنان دڵی پێشمەرگە
دڵی پۆڵای پڕ لە بەرگە
جۆش ئەخۆن بۆ پاراستنت
سوپاس بۆ ڕزگارکردنت
حسین گلێنەی لێژی شین
چەکیان جەزرەبەی بەتین
تانکەکانیان و تومیگەن
ناتوانن میللەتی ئەردەن
واز پێ بێنن لەو خەباتە
کە بۆ رزگاری وڵاتە

بەچاوی گەشی نادیە
کە مەشخەڵی ئازادیە
بەدەردی (خزمەکەت) ئەبەن[10]
وەکو ئەو پەل پەلت ئەکەن
ئەی خوشکی نازدار نادیە
ئەمڕۆ رۆژی ئازادییە

١٩٥٨

[10] مەبەستی پاشای عێراقە

ئەی مەلانی چەم فەرموون بۆ شەپۆڕ
بــەنینۆکی ئاڵ بۆم هەڵکەنن گـــــۆڕ
من ئەوا ئەمــــــــــرم بێ ئاوات و دڵ
واسیس بووم وەریم وەکو پەڕەی گوڵ

لـــــەگەڵ ئێـــــــوەدام ئەی هەژارینە
نەك لە کۆشکێکا بـــــەرز و رەنگین بێ
ڕێ ی سەختی خەبات لای من شیرینە
نەك لە دوورەوە گوێم لە ناڵین بێ

بووکی ئاواتی بەرگی سپی پۆش
ئاڵای پیرۆزی کوردی گرتە کۆش
ڕێگەی لە دوژمن بەند کرد (ڕێبەندان)
کەوتە شنەشن ئاڵای کوردستان
ئاڵاکەم هەرگیز بیر ناچێتەوە
ڕۆژێك هەر ئەبێ بشەکێتەوە

# گلۆربوونەوە

لە مەچەك بازووی وەك ئاسن
لە گلێنەو دەسی خرپن
کۆشکی هەستان نهۆم نهۆم
ئەیوت ولآت هی خۆمە خۆم
لە قژی دەسکەنەکراو
لە دەماری لاوی کوژراو
هیلانەیەکی چنی بوو
ئەیوت ئەی ولآتی مردوو
منم شوێنم خۆش و بەرزە
دەنگم کێو دێنێتە لەرزە
بە روومەتی ناسکۆڵە و سوور
بە دەم و پەنجەی وەك بلوور
نەخشانبووی کۆشك و تەلار
قاسەی سیخناخ بوو لە ملیار
ئەیوت منم خواوەندێکم
بە یەك ئان سێ گیان ئەپێکم
لەیەك کاتا هەزاران جێ
بە فەرمانم وێران ئەبێ

منم دەستداری خوێن مژێ
کەس ناتوانێ من بکوژێ
کەچی کاتێ ڕەشەبای قین
گێژی دا لوورە لوور بەتین
هێلانەکەی تووڕدایە ناو
گۆمی قووڵی سووری خوێناو
ئێسقانی لاشەی لەشارێ
وەکو زیخ کەوتۆتە ژێرپێ

١٩٥٨

# ولاتی من

ولاتی من شیرینە
خاکێکی نازەنینە
بەهار، دەشتی زەرد و سوور
ئەبێت بەکۆمەڵی نوور
لە تەلانی باخەوە
لەسەر لوتکەی شاخەوە
ئاوی روونی رەنگاوڕەنگ
ئەیکا بە جۆشی ئاهەنگ
هاوین نزاری نازدار
شاخی هەزار بەهەزار
شەوی فێنکی کوێستان
دیمەنی بەری بەیان
باخی زەرد و سوور و چڕ
ئاوی تەزیوی دەنگ گڕ
بەفراو ئەڕژێت تك تك
بۆ دەمی گوڵی ناسك
قاسپەی کەوی بەیانی
کە، لەرەی دێت بەجوانی

ئاواز هەڵ ئەسیّ گەش گەش
بەرەو شەخەڵێکی رەش
شەماڵی دوای نیوەشەو
کاتێك چاو ئەچێتە خەو
باوەشێنی ئارامە
چپەو نەغمەی بەتامە
کە بەیانیان گوڵی بووك
نەشمیلانە و ئێسك سووك
کراس دائەماڵیّ سەوز
مەل ئەکەوێتە وەنەوز

١٩٥٧

مانگ ئەنوارێتە شیو و گرد و دۆڵ
بزانێ ئاخۆ گرتوونی سەهۆڵ
هیچ ڕەنگێك نی یە بتوانێ سەرجەم
بێ بە بەرگی کەژ، چیا، دەشت و چەم
بەتەنیا بەرگی سپی (بەفرانبار)
دائەپۆشێ گرد، لوتکەی شاخ و نزار

کەی گەردەلوولی سوارەی ئازای کورد
لەم کەژانەدا بەتاو هەڵی کرد
خونچەی ئارامم ئەگەشێتەوە
ئالآی شادی دڵ ئەشنێتەوە
هاوڕێم، هەرکاتێك لە لووتکەی چیا
مردم، ئەوساکە پێم بڵێن، ژیا

## بووکی سەیوان

کچی جوان گەردنی نەرمی وەکو گزنگی هەتاو
کەمەری تەنگ، قۆڵی سپی، قژی زەردێکی خاو
پەنجەی تابڵێ ی ناسك، چاو بە ورشە ورشی کاڵ
نزیك چەناگەی ناوەڕاست چاڵی تاقە یەك خاڵ
کچی جوان لەش و لاری نەخشی ئەوپەڕی جوانی
شەرمی، هەستێکی نیانی هەڵ ئەدا هەروەکو کانی
هەر زێڕ بوو لەپشتی سەری یەوە تاکو کەمەری تەنگ
بریسك و هوڕی وەکو سنگی بەهار جلی ڕەنگاوڕەنگ
دڵی بەکوڕێکا چووبوو هەژاربوو، بێ تەلار
پارەی نەبوو، سامانی نەبوو، بێجگە لە دڵی هەژار
ئەو لاوە نەی ئەوێرا داوای کچە بکات تا مردن
دووریش نەبوو هەر ناوهێنانی بەتەنیا نەبێتە هۆی کوشتن
چونکە سەروەتی ڕەشی گلاو ڕێ ی لێ تەنی بوو تا ئاسمان
ئەو کچە دەوڵەمەند و ئەم هەژار و بەبێ سامان
خۆ ئێستە دڵیش هەر بەپارەیە مامەڵەی پێ ئەکەن
یەکێك بچێتە - داوای - دڵێك، ئەڵێن چەند پارە ئەدەن
کچە بەزۆر مارەکرا لە پیاوێکی پیری دەوڵەمەند
بەسنووق پارە و ئاڵتوونی زۆری هەبوو نە بە کەمەربەند

فرمێسك کە ئەڕژایە سەر گۆنا دڵۆپ دڵۆپ ئەتووت
کە هێزی مردنە وادێتە خوارەوە کت و مت
پەنجەی ئەم و ئەو ئارایشی رووی کچەکەیان ئەکرد
فرمێسکی لێڵیش ئەیسڕی و، ئەو ڕەنگە ئاڵەی ئەبرد
بووك ئاریشی کرا بە سووراوو پشتێن و گەردانە
هەنسك و دڵی بەخورپە کەوتەڕێ، هی ئەو کچە جوانە
بەو نارەزایی یە بەزۆر دایان بە شوو بە نابەدڵ
سا چۆن نەوەرێت ئاواتی ئەو کچە هەروەکو گوڵ
ئەوەندەی پێ نەچوو هەروا چەند مانگێك نەبێ تاڵ
بووك بوو بە بووکی سەیوان و بەمیوانی ناو جەرگی چاڵ
بەو داخەوە سەری نایەوە بەو دڵەوە بوو بەمیوانی گڵ
نرخی چی یە ئیتر دوای مەرگی ئەو توخوا پارە و خشڵ!!
کەس وکاری نەیان ئەزانی بگرین بۆ دڵی یان بۆ گیان
بەدەستی خۆیان بوو، دڵیان پلیشانەوە بۆ سامان
ئەی بووکی سەیوان، یادت لە گوڵی ئەرخەوانا سوور
بۆ مەرگی زۆرداری یە، هەستی من شەپۆل ئەدا بێ سنوور

١٩٥٤

ئەی ملکەچ وەك تۆ زێڕناپەرستم
پاك و خاوێنە باوەڕ و هەستم
نامەوێ لەسەر ئەرکی کەس بژیم
بەخوێنی هەژار رەنگ بکەم دەستم
***

هەر زوو زنجیر و پێوەندت شکان
بۆیە تاماوم من بە تۆ ناگەم
زنجیر لە پێم و هەورازە ڕێگەم
***

من کەزانیم دەوڵەمەندی بۆ دز و بۆ چووختی یە
بەرهەمی گیرفان بڕین و کردەوەی ناپووختی یە
هەرکەسێ سامانی زۆر بێ خوێن مژ و چەوسێنەرە
دیارە بێ نانی و هەژاری بەرزی یە و خۆش بەختی یە

# پایز (نەی)یە

قەڵبەزە ڕەنگی وەك چوڕە
تاڤگە بەئاواز و گوڕە
ئاو هاژەیە دەنگی چەمە
ڕەنگی ئاسۆ سووری دەمە
ئەو دەنگ و سۆزە هی نەیە
لەپاڵ ئەو شاخەوە کە یە
قاسپەی شیرین سازی کەوە
بەیانییە و ڕۆژی نەوە
سەرسنگی کەژ بریقەدار
دامەنی ڕازاوەی نزار
بەفر لەکەل ئەتوێتەوە
چەند بەجوانی ئەچێتەوە
سنگیان ئەشۆن بەردی کەنار
بەئاوی بۆنخۆشی بەهار
بەتیشکی خۆر شەونمی گوڵ
بریسکەو باقی وەك خشڵ
خەرمانە وا شەپۆل ئەدا
شەماڵ ئێستە کە هەڵئەکا

پایزی زەردی ماتەمم

رزیو لەگەڵ دەرد و خەمم

مەلێکی نەشمیلی بزێو

شاد و خومار کەمێ پەشێو

بەدەم ئاوازەوە ئەڵێ

ئەی مەلی چەم کە رۆژ هەڵێ

بڵێن پایزی زەرد نەیە

بەهارە رۆژی ئۆخەیە

باڵدار بەپۆل کە هەڵئەسن

گوڵ لەخۆشیدا شنەشن

دەمی پاراو ئەکاتەوە

ئاوی ژیان ئەخواتەوە

کیژۆڵەی شۆخ و شەنگی دێ

بەنەرمی پێ لە گیا ئەنێ

لەرەی دەنگی بەسۆز و کوڵ

گۆنای شیرینی وەکو گوڵ

بەناو کەژا دێن و ئەچن

مەلیش مەلی جوان و جرپن

لەگەڵ فرین و خنەخن

هەرئەخوێنن هەرئەخوێنن

بلێن پایزی زەرد نەیە
بەهارە ڕۆژی ئۆخەیە
لاوانی دێ دەست لە کەمەر
لەناو ئاوایی و دەشت و دەر
بەدەنگێکی پڕ لە ئاوات
بانگ ئەکەن ڕۆژی بەهار هات
دەنگی هەموو گیانلەبەرێ
بەسۆز و کوڵ دێتەدەرێ
بلێن پایزی زەرد (نەی)یە
بەهارە ڕۆژی ئۆخەیە

١٩٥٥

# ئەی مەرگ یا ئەو پەڕی ناسۆر

ئەی مەرگی شیرین بم بەقوربانت
بەقوربان بزەی شیرینی جوانت
بەقوربان زەردەی سەر لێوی ئاڵت
بەقوربان دیدە و و لاملی کاڵت
فەرموو سەر دیدەم ئەی دیدە ئاتەش
دای پۆشە نورم بەچاوپۆشی ڕەش
فەرموو بە پەنجەی رەنگێکی نازدار
تاو تاو دەربێنە تاڵی دڵەی تار
فەرموو بە چنگی سووری خوێناوی
لە سنگ بێنە دەر دڵەی سووتاوی
بێ نازداری من، بێ چاری ژینم
لە سەوزی وەڕست عەواڵی شینم
پێکێك تا سەرلێو لە خلتەی جەخار
بنێرە سەر دەم منی گرفتار
بەڵام چۆن پێکێك دوا پیاڵەی خەفەت
تا دڵ و جەرگم بکا بە سەد لەت
سا فەرموو سادەی لە پەردەی شەپۆڕ
بەڕەوتی ڕەوان بەبێ شەڕو شۆڕ

بەلەنجە لەنجی سەر نووکی پەنجە
بێ بەرەو پیری ئەم ژینی گەنجە
بەشادی نەلێیت میوانە مردن
چونکە دەمێکە تۆراوە لە من
بەناسۆر بلێ بەسیە لێ ی گەڕێ
پاش ساتێکی تر گیانی دەرئەچێ
زۆرم سزا دی لێزمەی پەژارە م
هەر لیتەی هێنا و هەر قوڕاوی خەم
دڵ شەیدای تۆیە ئەی شەیدای دڵان
ئەی دۆستی گیانی ئەی گیرۆدەی ژیان
فەرموو سەرچاوم یاخوا بەخێر بێ ی
لەبیرت نەچێ بێ لە دڵ بنێ ی

***

١٩٥٥

# دڵداری کوڕە شوان

کچی ئاغا: گزنگی زێڕینی خۆری بەیانی
خۆی سوو لە گوڵاڵە و سەرسنگی کانی
ئاورنگی سەر گۆنای گوڵی سوور تکـــا
هۆنراوە بێ سرووەت وا لە عەزرەتا
خۆر دەمی ناوەتە سەر دەمی نزار
چەم دەمی ناوەتە سەر سنگی گوڵزار
مەلانن پەتیارە لە عەزرەتی گوڵ
بێزار نین لەژانی توترك و چقڵ
سا لەگەڵ ئاوازەی بەسۆزی شمشاڵ
لەرەی بێت ملت ئەی شوانی چاوکاڵ
کوڕە شوان: گیانەکەم گیانەکەم کچۆلەی ئاغا
چۆن وێرات بیێیتە لام بێ ترس و پەروا
ناترسی خەنجەری زۆرداری لە پڕ
بڕژێ خوێنی دڵ بەلێزمە و بە خوڕ
تۆم ئەوێت نەوەك زێڕ تۆم ئەوێ بەتەنها
بۆ تۆیە دڵی من بەژانا چزا

زرەی زێڕ بەقوربان دەنگی تریقەت
بریسکەی بەقوربان خەندە و بریقەت
سەرکەوە سەرکەوە سەرکەوە بۆ کەل
بەلـەنجە و بەرەوتێك وەکو رەوتی مەل
کچ: کۆشکەکەم بەقوربان خاکی ژێر پێتە
سەری من هەمیشە گیانە لـەرێتە
کورە شوان، کورە شوان، دڵنیابە تۆ
دڵی من بۆ تۆیە و ناتکەم دەستخەرۆ
باوکی کچەکە: ئەو دەنگە پێم ناڵێن دەنگی کێ یە دێ
لـەو کەژە و لـەو دۆڵە بێ باك هەڵ ئەسێ
ئامۆزای بەدی نازەنین:
ئەو دەنگە گۆرانی نازەنین خانە
دڵدارە سووتاوە گیرۆدەی شوانە
گوێت لێ یە پێی ئەڵێ: هۆهۆ کوری شوان
نەوەك خۆم باوکیشم ئەکەم بە قوربان
باوك: ئا سوار بن بەتاوێك بەرەو دەمی کەل
ئەو شوانەم بەخەنجەر بۆ بکەن پەل پەل
گۆشتەکەی فرێدەن بۆ قەل و بۆ داڵ
گلێنەی هەڵکۆڵن بەدەمی شمشاڵ

کچ: گیانەکەم دیدەکاڵ، گیانەکەم دیدەکاڵ
کوا دەنگی شمشاڵت بە سۆزی قەد پاڵ
ناو دڵم بێنە کوڵ بەدەنگی شمشاڵ
باوك: مەیکوژن بیهێنن با لەگەڵ سزا
ئەو گیانە بۆگەنەی لەژینی دەرکا
بابەدار قەبرغەی بکەم بەخرِخاڵ
بەپشکۆ گلێنەی بکەم بەزوخاڵ
مەیکوژن بەسوژن چاوی دەردێنم
بۆ نازە جەرگەکەی ئەبرژێنم
کچ: بابە گیان کوا ڕەوای کاری ئینسانە
وا ئەکەن لەو شوانە بەسزمانە
دڵدارە مەیکوژن، خەڵکە دڵدارە
بۆ کفرە دڵداری، چونکە هەژارە
لەجیێ ی ئەو ها دڵی من ئەنجن بکەن
چاوی من بەسوژن بەدار کون بکەن
کورِە شوان بەقوربان سۆزی کوڵمت بم
بەقوربان ئارامت، هی هەناوت بم
بەقوربان دڵۆپێ خوێنی دڵت بم
بەقوربان لا ملی وەك هەتاوت بم
باوك: کوا زیرەی قامچی و دار لەسەر پشتی بێ
ماندوو بوون! داوەشێن، هەی دەستان شکێ

سزای دەن، سزای دەن، دەمە و بەیان
نەلەرزن بەناڵە و سۆزی گریان
کچ: دەمە و بەیانە، شەپۆڕی بەهار
ماتەمی ژینە و هی دڵی دڵدار
ئەو تان کوشت، بەڵام دڵ تاکو ماوە
بۆ ئەو شینیەتی و بۆ ئەو سووتاوە
دەك بن بە قوربان پێ ی کرێشاوی
ڕەنجبەری برسی پەنجەی خوێناوی
دەك بە قامچیەکەی خۆتان پەت کرێن
بەپەنجەی کوڕی خۆتان بخنکێن
دەنگێك: نازەنین شێت بووم، وێڵ و پەتیارە
کەژاو کەژ ئەکا، ڕێگای جەخارە
دەرمانی دڵەی تێکەڵ بەخۆڵە
پەژارە چێژ و هاودەمی چۆڵە
کچ: ئەی مانگ تا مردن هاوڕێ ی تیشکی تۆم
سەرینم چقڵ وەك مەڕ گیا ئەخۆم
ئەی شەماڵی هاودەم ئەی دەنگی شمشاڵ
کوا نیگای مەنگی شوانی دیدە کاڵ

١٩٥٥

## كە مردم

من نەمرم
نایەڵم کەس بم نێژێت
دوا سەرنجم ئاو نەدەم
بە بریسکەی رم
بە تروسکەی ئاوات
بە هێرشی سەرکەوتن
***

دوا هەست و تاسەم هەڵئەکێشم لە گیانی:
دەنگی سروودی ئازادی
نرکەی تۆڵە
چریکەی دیلی ئازاد بوو
زرەی زنجیری شکاو
گرمەی زیندانی رماو
هاژەی جۆگەی خوێناو

ئەمرم
نایەڵم کەس بمنێژێت
ئەمرم لەگەڵ ئاوازی:
تەپڵدا
ترپەی پێ ی سوارەدا
هاواری هەڵمەتدا
شریخە شریخەی گوللەدا
کاتێك کە زۆردارە بەرازەکان
دوا ئاخی مەرگی سەرشۆڕی
هەڵئەکێشن

***

کە مردم
مەمنێژن
با لاشەم ببێتە پێشێلی لەشکری سەرکەوتوو
هێزی برسی و هەژار
سوپای بۆ ئازادی تینوو
چەند بەرزی یە مەرگی پیرۆز

١٩٥٤

## کۆتری ئاشتی

بەیانی یە
تۆ بخوێنە
ئەی کۆتری سپی نەشمیل
قاچ ئاڵتونی نەرمی خنجیل
تۆ بخوێنە
بەیانی یە
کاتی خۆشی و گۆرانی یە
لە خەو هەموو
راپەڕێنە
ئاواتمان ئاوەدانی یە
بەیانی یە

***

لەسەر سنگی دایکی هەژار
ساوا، مناڵ
چاوڕەش و، کاڵ
نازدار، نازدار
بزێو، بزێو
زەردە بەلێو
خەبەردار کە
بەیانی یە

تۆ بخوێنە
بۆ پیر و جوان
بۆ پاڵە و ڕەنجبەر و بۆ شوان
بانگی ئاشتی بۆ ئاوەدان
بەو جوانی یە
***

با بێتەدەر
بۆ گشت بەشەر
بۆ ئازادی و حەقی ئینسان
منداڵ بابێنە هەڵپەڕین
بە ئاوازی ئاشتی شیرین
بتنێنە سەردەسی خرپن
بانگ کەن ژیان نەوەك مردن
کاتی خۆشی و گۆرانی یە
تۆ بخوێنە بەیانی یە
***

بانگ دە بڵێ!
"تف بێت لە شەڕ
"تف لەچارەی شەڕگێر گەڕ
"تف لەپارە و زێڕی گلاو
"تف لە ئیستعماری بەدناو

نامانەوێ

حەق ژێرکەوێ

بڵێن، ڕۆژی گرانی یە

هیوای ئێمە هەرزانی یە

ئازادی و کامەرانی یە

تۆ بخوێنە بەیانی یە

کاتی خۆشی و گۆرانی یە

***

ئەی کۆترم ئەی مژدەبەر

تاجی ئاشتیت ناوەتە سەر

ئەم پەنجانە

پەنجەی هەموو

ئەم گەلانە

پەرژینە بۆ ئاشتی بەشەر

بابێت سۆزی ئاشتیانە

لەو چەمانە

لەو کەژانە

بۆ خۆشی و شادمانی یە

بەیانی یە

کاتی خۆشی و گۆرانی یە

***

تۆ بخوێنە
با بێنەدەر
شوان و سەپان
کاکەی ڕەنجبەر
داس لەسەر شان
ژنان و پیاو
قۆڵ هەڵکراو
لەشکرێکی ئینسانی یە
بۆ ئازادی قوربانی یە
بەیانی یە بەیانی یە
کاتی خۆشی و گۆرانی یە
***
شەبەق ڕەنگی وەك ئەرخەوان
ڕووناك و دڵ فڕێن و جوان
لوتکە و نزار
بە لالەزار
رازاوو جوان و نەخشاون
گوڵان بەشەونم پاراون
ڕۆژێکی شادمانی یە
ژێرکەوتن بۆ شەڕانی یە

گەلان یەکن جیاجیا نی یە
تۆ بخوێنە بەیانی یە
کاتی خۆشی و گۆرانی یە
***
تۆ بخوێنە بۆ زەرد و سوور
بۆ میللەتان نزیك و دوور
بۆ کاکەی رەش
دڵ پاك و گەش
بۆ سپی و رەش لەگەل یەکا
کە بانگی ئازادی ئەدا
بۆ ئاوەدانی ی سەرزەوی
سەرئەکەوی
سەرئەکەوی
ئەی کۆترم بەو جوانی یە
تۆ بخوێنە بەیانی یە
***
ئەوانەی کۆشکیان سەد قاتە
بادەیان خوێناوی لاتە
بۆ ئاخنینی قاسەیان

ئەیانەوێ
گەڵ ژێر کەوێ
کڵپەی شەڕێك هەموو جیهان
بسوتێنێ
تا ئەو زێڕی لێ دەرهێنی
باکی نی یە
ئەو وەحشی یە
خوای شەڕ فرۆش
بەخوێن سەرخۆش
لەوەی ئەگەر کەس نەمێنێ
شەڕانی یە
سەرمایەدار
بارزگانی چەك و خوێناو
باکی نی یە
دنیا بەخوێن بێتە لافاو
پارەی ئەوێ
قەسری ئەوێ
ئەو شەڕ چی یە
بەڵام قەڵای هەر ئەنەوێ
سبەینێ تەختی ئەکەوێ

ئەوکەسەی بڵێ وانی یە
یا لەوانەیە
نۆکەرانە
وەیا باوەڕی زۆر کزە
دوور لەزانین و لەمزە
تۆ بخوێنە بۆ سەرکەوتن
ئەی کۆتری جوانی گۆشتن
بەبێ گومان
هێزی ئینسان
سەرکەوتووە
شەڕ تیا چووە
ئەو کەسەی بڵێ وانی یە
نادانی یە نادانی یە
تۆ بخوێنە بەیانی یە
بەیانی یە
کاتی خۆشی و گۆرانی یە

١٩٥٤

# لای لایەی ئەمڕۆ

کۆرپـــەی شیرینـــم بێرە کــۆش
رۆڵـەی بەشیر مەست و سەرخۆش
بێ بنۆشە تۆ پڕ بــەدەم
بادەی ژیانت کۆرپەکەم
بێ، نێرگسە جـــاڕی بەهــار
بێ، چاوگەشم، بێ، قۆچکەلار
بێ، ناودەمت با هەڵـمژم
بێ، دەم بـــەدەم بابیمژم
روومەت گوڵی چەناگە گوڵ
باڵندەی جـــوانی لانــەی دڵ
لـەو رۆژەوە مـــن مناڵ بووم
هەر بەرەو بوونی تۆ ئەچووم
بەری دڵـــم، مـــایـــەی ژیان
بەخشندەی زەردەی سەردەمان
بەندی جگەر خۆشی بەسەر
بەنرخ و فەڕ ئەی بێ زەرەر
بێ، نووری هەردوو چاوەکەم
بێ، دیدە مــەستی نوقڵـــەدەم

ناتدەم بە کەس پیـــاوی ناکـــەس
بیٚ هەست و سوود و بیٚ دەربەس
بدا بە کوشت بۆ زیـوو زەڕ
بیت بە خۆراکی خوانی شەڕ
ئەی کۆتری سپـــی جوانم
ئەی لـەرەی لـەحنی رەوانم
تۆ دۆستی گشت منالاّنی
رەش بیٚ و سپـی، برایانی
دوا روژی رووناك و خۆشە
چاو لـە دوژمنت مـەپۆشـــە
وریابە دەستەی سەرمایە
نـــەیشێوێنن ئـەم دنیایە
نەیکەن بە کلّپەی سوتێنەر
تیا بسووتێت رۆلّەی بەشەر
جوانی مانگی بریسکەدار
رەنگی گولّی ناو لالـەزار
شنەی شەمالّ لـەرەی لقان
چاوەندازی شیرین و جوان
بیٚ تۆ ش شین و زاران
بیٚ تۆ ژن و پیاو بێزارن

تۆی تریفەی مانگی دەم کەل
تۆی ئاواز و جـریوەی مـــەل
تۆی ئۆخەی دڵ خۆزگەی بەکوڵ
تۆی رەنگی گوڵ تۆی بۆنی گوڵ
ناتکەم بە ئاگری بـــەتین
بسوتێنیت خەرمانی ژین
ناتکەم بە نوکی شیر و تیر
ناتکەم بە پێوەنـــد و زنجیر
هەموو کۆرپەی هەموو کەسان
نـــازدارن بـــۆ دڵـــی ئینســـان
دەست لـە خوێناوا سور نەکەی
بۆ شەڕگێڕان خزمەت نەکـــەی
ئەتکەم بە قوربانی هیوا
هیوای گەلی پتەو بڕوا
ئەتکەم بە بەردەبازی ڕێ
میللـەت پێت بەسەرا بنێ
بە ئاشتی کۆرپەم رۆڵـەکـــەم
تا دوارۆژ پەروەردەت ئەکەم

١٩٥٤

## ئاشتی

دایکی دڵسۆزی جگەرسووتاوم
برای ئازیزی براکوژراوم
خوشکی سزا کێش، دڵ بە خەم کف بوو
لاوی بەقیمەت خوێنی گیان هەڵچوو
پیری پەك کەوتەی فرمێسك قەتیس ماو
شەڕدیو، دڵ بەقین، خانەو ماڵ سووتاو
خەڵکینە ئێوە هەموو بە یەك جار
کرێکار رەنجبەر، دەوڵەمەند جووتیار
تێکۆشن بەدڵ بۆ ئاشتی دنیا
ژیانی گەلان، ناوجەرگەی هیوا
بانگ کەن بەیەك دەنگ دەنگی دلێران
ئاشتی نەوەك شەڕ شەڕی دڕندان
ژیان نەك مەرگ، ژیانی ئازاد
دیموکراتی و هەق و خۆشی و داد
نان نەوەك گوللەی گەرمی جگەربڕ
شادی نەك گیانی شەقار و وڕ
شار نەك وێرانی، دێ نەك بۆمبای کوێر
نابێ دنیامان بکەن سەرەوژێر

ڕووناکی نەوەك تاریکی و ناڵین
جل نەوەك تانکی قورسی ئاسنین
قەیما غ و شەکر نەوەك شیر و تیر
ئازادی نەوەك پێوەند و زنجیر
زەردەی سەرلێوی ساوای بەخەندە
نەوەك بریسکەی قەمەی کوشندە
قاقای بەسۆز و پیرۆزی دایکان
نەك شین و شەپۆڕ گریەو لەخۆدان
وەرن ئەوانەی دڵ پڕلە قینن
ئەوانەی جگەر پڕ لە برینن
ئەوانەی بەرگی خوێناوی بە کۆڵ
بێ بەرگ و بێ نان ئەڕۆن دۆڵاودۆڵ
ئەوانەی کوڕتان لەدار دراوە
ئەوانەی ماڵتان وێران کراوە
ئەوانەی گۆڕی ئازیزتان گەرمە
ئەو ئینسانانەی کە دڵتان نەرمە
بانگکەن بەوێنەی بروسکەی بەتین
ئاشتی و ئازادی نەك ژینی ژەهرین
نە گۆیژەی زەردی ئاڵتوونی جوانت
نە پیرەمەگروون نە هەورامانت

نە گیای نەرمی جوان نە بی، نە چنار
نە لالـەو نێرگس نە سێو نە هەنار
نە شار و نە دێ نە جادە و کۆلان
نە گوڵ نە بولبول نە دۆڵ نە باخان
کەژ و دار و بەرد خاك و خۆڵ یەکسەر
دوشمنی شەڕن هەموو سەراسەر
کۆترێکی سپی، دەنووك سوورەگوڵ
وا لـەئاسمانا ئەفڕێ زۆر بەکوڵ
خوای شەڕیش تیری لـەناو کەوانا
چاو سورِ ئەڕوانێت بەئاسمانا
تیری ئامادە بۆ مەرگی شادی
هێزی لـەکاردا دژی ئازادی
بانگ کەن پیێ ی بلێن جانەوەری شەڕ
ئەگەرچی خۆشت بکەیت لاڵ و کەڕ
وا هاوار ئەکەین "سنگمان قەڵغانە"
بۆ ئەو تیرەی تۆی لـەناو کەوانە
سەری ئەو تیرەت ئەکەین بە دڵتا
تەخت و بەختەکەت ئەخەینە ژێرپا
لـەسەر ئەژنۆی گەل گەلی ئاشتیخوا
ئەتهاڕین وەك خۆڵ ئەشەت کەین بەربا

ئەی شەڕ چەند بەد خوو ناپەسەنکاری
دوشمنی رووت و پۆشتە و هەژاری
ئەرخەوانەکەی سەیوان شایەتە
کە چەند گیانی گەنج وا لەژێر پێتە
چۆن لە دەشتی وەیس لەلای شێخەباس
خەڵکی کەلاکیان ئەپچڕی بە گاز
سەربازی تورکی برسی ی بەسزمان
چۆن گیایان ئەخوارد هەروەکو حەیوان
چەند تورك و عەرەب لەم دەبۆیەدا
بێ گوناه ئەکران بە سێدارەدا
چەند رۆڵەی شاری سولەیمانیمان
لە حومس و حەما بەر دەستڕێژ دران
هەزار بەندی دڵ وەك قالەی نەبات
بەسۆنگی جەرگ و دڵ و سی ی دەرهات
سەدانی وەکو حەمدی گورگەبۆر
پەت لە گەردانداا مردن بە ئاسۆر

چەند ساوای کەساس زۆر بەئاسانی
سەگ و گورگی هار بۆخۆی فڕانی
لەبیرتان نی یە ئەوسا گۆشتی کەر
بووبووە خواردنی دانسقەی بەشەر؟
چەند کەس بیّ کەس و بیّ پەناو بیّ نان
شێت بوون و کەساس دایانە کێوان
چەند ناموس تکا چەند شەرەف شکا
چەند کەس سەربڕا چەند لانە شێوا
ماڵی "عارف بەگ" بە بۆمبای گران
چۆن بە خەڵکەوە بوو تەخت و وێران
چۆن بە سەبەتە ئێسقانی مردوو
هێنرانە دەرێ لە دارو پەردوو
چۆن شۆرانەوە و چۆن سولەیمانی
ئەم ناسۆرانە و گشت سزا و جەخار
هەموو تاوانی شەڕی ئیستعمار
بمرێ زۆرداری بمرێ شەڕگێڕان
هەربژی ئاشتی بژی میللەتان
ئەی کوردی نەبەز هەموو ڕاپەڕن
لەغاوی پیسی شەڕگێڕ هەڵدڕن

لەبیرت نەچێ ئەی کوردی نەبەرد
ئەی لاوی دڵسۆز ڕۆڵەی جەوانمەرد
تۆ یاساوڵی ئاشتیت براگیان
بۆ ئاشتی ئەبێ خۆت کەیت بە قوربان
بەیادی کاوەی چەکوش وەشێنت
شۆڕشی سووری سەرتاپا خوێنت
بەیادی ڕۆژی نەورۆزی میللەت
هەموو بۆ ئاشتی سا بکەین هیمەت
چەکوش لە مێشکی خوای شەڕا وون کەن
ئاڵای ئازادی و ئاشتیتان هەڵکەن
بانگ کەن هەربژی کورد و کوردستان
هەر پایەداربێت سەلامی ئینسان

*

# نابەزین

بیکەرەوە دەرگای رەشی زیندانت
دابرێژە کۆتی قورسی گرات
شوورە بکێشە لە پەنجە و بازوو
لەناو خوێناوا شوورەکەت هەڵچوو
بابۆم شەپۆل دات تاریکی مەنگت
ئەی زنجیر بابێت، لە پێما دەنگت
بابێت قامچی و دار، بەن لە تەختی پشت
بەفەن ئەو گۆشتەم، بۆ بکەن برِشت
کوا قامچی، کوا دار، کوا زرِەی زنجیر؟
کوا خوێن، کوا سزا، کوا نرکەی ئەسیر؟
سزام دەن، سزا، پرژان و ئازار
نایبیستن ئاهێك، ناڵەیەك، هاوار
دەستان هەڵمەگرن چی لەبارتانە
درێغی نەکەن لەو سزادانە
نەفیم کەن بۆ دوور بۆ سەحرای بێ پەی
بێ ئاوو سێبەر بێ هەورو نرکەی
هەردە پەنجەکەی پێم هەڵبوەرێنن
لەدارکاریما قەت دامەمێنن

لە تەختی پشت و روومەتی زەردم
بۆم دابتاشن دوو کێل و بەردم
لەسەر تاتەشۆر بە خوێناوی خۆم
لێم گەڕێ بێ هەست تا خۆم خۆم ئەشۆم
لە پێستی ژێر پێم هی پشتی دەستم
کفن هەڵدڕن بەتاوی هەستم

***

وازکە دەروازەی ڕەشی زیندانت
قوربەسەر خۆت و خزمەتکارانت
بە پشکۆی ئاگر روومەتم بەداخ
ونجڕکەن وێنەی نەقشی سەر بەیاخ
سنگم شەقار کەن نەك سنگی بێ خەم
لەت و پەتم کەن هێشتا کۆڵ نادەم
کۆڵ نادەم ئەبەد هەتاکو مەرگم
ئەبم بەقوربان گەلی بێ بەرگم
قامچی کوای لەکوێ ی پشتی زامدارم
پێت ئەڵێ ڕووڕەش ناڵێم "بێزارم"
مەچەك کەلەپچەی بەزان بەجارێ
ئەگەرچی خوێنی پیا دێتەخوارێ

پێ، پێوەندەکەت دائەڕزێنێ
گەردنت تەوقەکەت هەر ئەپسێنێ
دەلاقەی زامم قەبری ستەمکار
جێ داری لێدان فەخرە بۆ هەژار
ئێمە دوژمنی دیل و کوڕنووشین
زیندانی تارت هەر هەڵ ئەلووشین
باوەڕ بەهێزتر لە دارو ئاسن
لە سێدارەتان بەهێزتر گەردن
ئەتکەین بەقوربان پێ ی کرێشاوی
ڕەنجبەری برسی پەنجە خوێناوی
ژیان ببێتە کۆڕی ئاگرین
دنیا وەرگەڕێ ئێمە نابەزین
لەناو قەفقەفی زنجیری زۆردار
قەڵای دوارۆژین، مردن بۆ زۆردار
لەچاوی دایکا دڵۆپێکی سوور
لەناویا شێوە و دیمەنی جەسوور
رۆژ، دوارۆژ ماچی ئەکا لێوی کەل
ئەیکا بە قەقنەس ملۆزمی گەل
ئەو خوێنەی کانی ی دڵ هەڵی ئەدا
نەخشی ئەکێشێ ئازادی تیادا

سەیر کەن ئەوا دڕندەی کوڵدان
واتاسا لەژێر پێ ی قارەمانان
وازکە دەروازەی رەشی زیندانت
دوارۆژ بێ سوودە ناڵە و گریانت

١٩٥٤

# لەدایك بوونی ئینسانێك

شەو
تریفەی مانگ
لوورەی تیژ
هاژەی ئاو
خوڕەی چەم
دێ ی بێ دەنگ
لە دۆڵێکی کپی متدا
لانکەی برسی ڕووت
پێستی بەسەر ئێسکدا لکاو
شیتاڵی چڵکن
دەستی پۆخڵ
پێ ی کرێشاوی
پێسی بەدار جەزرەبەدراو
چاوی فرمێسکاوی
دێ ی بێدەنگ
گۆزەی بەتاڵ
خەپلەی کەڕواوی

زنجێکی تاریك

دەنگێکی تازە

گیانێکی تازە دێتە ژیانەوە

بانگێکی تازە ئەدات لە پەردەی بوون

منالێك وا بێ مامان لە ژنە جووتیارێك بوو

چاوی سەرسام سەرنجی ئەو پارچە گۆشتە ئەدەن

چۆن ئەژی؟

چۆن ئەمرێ؟

بەکۆتەوە یان ئازاد؟

هەروەك ئەمان یان باشتر؟

خۆیان نازانن

من ئەزانم

بێ گومان بەئازادی ئەژی

تریفەی مانگ

ژیانی تازە

## ئامۆژگاری بۆ ئاسۆی برازام

ئاسۆ وەك ئاسۆ بەرز و بڵند بە
بۆ کەڵکی مەکتەب چەشنی پڵنگ بە
گیانت پێشکەشی نەتەوە بکە
لە ئیش و کارتا ئیشی ورد بکە

لەجێ ی گرِوگاڵ تۆ بڵێ کوردم
گریان نەزانی و قەت مەڵێ دوردم
بەسە شیر مەخۆ، شیر بۆ منالّە
شەرمت بێ، زل بووی، بەسیە ئەم حالّە

بەچکە و منالّی گشت دراوسێکان
بۆ قوتابخانە ئامادەن هەمووان
دەسا درەنگە رۆڵەی شیرینم
تۆش وەك ئەوان بە، کۆڵەکەی ژینم

بخوێنه و، بیره ریزی خوێندەوار
نەك ماڵ بۆ تۆ بێ، گیانیش هەزار جار
گەر غافڵ نەبی و تیریش نەخەوی
ئینجا ئەو ساکه باش سەر ئەکەوی

ئەوسا ئەبیتە یەکە پیاوی گەل
لەداری هیوا ئەکەی پەلاوپەل
ئەبیتە پیاوی دوارۆژی وڵات
بەنرخە زەوی و زاری خۆت لەلات

بۆ ماڵ و پارە دڵ بە جۆش نابی
بۆ بەرزیی خاکت وەك بێهۆش نابی
دەسم داوێنت ئاسۆی برازام
ئامۆژگارییەکەم تەواو بکە ڕام

هەر لە ئێستاوە تا مێشکت پاکە
نیگاری لەسەر بکێشە چاکە
نەك لەدواییدا بۆ ناوونیشان
چش کەی لەگەل و پشت لە نیشتمان.[11]

١٩٤٥

---

گۆڤارێکی دەنگی گیتی تازە ژمارە (٥)ی ١٩٤٥.

# پێرست

وەک بە تەنیا هەنگاو بنێم وەهایە
کەس لەگەڵما بەرەو ڕووناکی نایە
ئەو کەسانەی هاو ڕێگەمن وەک من نین
چاو چنۆکن هەر بۆ گیرفانیان ئەژین
هەش بەسەر و زەبوون ئەو هەژارانەن
کە چاوەڕی ڕەنجی درۆی ئەمانەن



نرخی ( 9000 ) دینار

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا